


# یادی کەلار

بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی ڕۆژی کەلار

ژمارە (3)ی شوباتی 2019

**لیژنەی سەرپەرشتیاری بڵاوکراوە:**

- مستەفا سەعید
- ئەحمەد محەمەد قادر
- ساڵەح هەلاج

**دیزاینی بەرگ و ناوەوە:**

- محەمەد زاری

**ناوونیشان:**

کوردستان - گەرمیان - کەلار

# لیژنەی ئامادەکاری
# فیستیڤاڵی ڕۆژی کەلار

## لیژنەی باڵا:

- شەهاب حاجی ئەحمەد( سەرۆکی لیژنە)
- مستەفا سەعید
- ساڵح هەلاج (ئەندام)
- ئەحمەد محەمەد قادر
- د. دارا حەمید
- مەریوان حەسەن
- محەمەد سابیر
- پشکۆ محەمەد
- بێستوون ژاڵەیی
- ڕزگار حاجی حەمید
- دلێر عەبدولڕەحمان
- دیار ڕەشید
- محمد عەلی عەزیز
- بڕیار محەمەد عەلی سەلیم

## لیژنەی سەرپەرشتی بلاوکراوە:

- مستەفا سەعید
- ساڵح هەلاج
- ئەحمەد محەمەد قادر
- ڕزگار حاجی حەمید

## لیژنەی هونەری:

- پشکۆ محەمەد (سەرۆکی لیژنە)
- دیار ڕەشید
- دلێر عەبدولڕەحمان
- سیروان حەسەن

## لیژنەی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکان:

- بێستون ژاڵەیی (سەرۆکی لیژنە)
- دلێر عەبدولڕەحمان
- بڕیار محەمەد
- مەریوان حەسەن
- هەردی سەرکەوت
- کاوە جاسم
- سیروان حەسەن

## لیژنەی دارایی:

- محەمەد عەلی عەزیز
- مەریوان حەسەن
- بەشدار لەتیف



# یادی ڕۆژی کەلارمان چۆن و لە کوێدا بە خەیاڵدا هات؟

شەهاب حاجی ئەحمەد
قایمقامی قەزای کەلار

ئەو کات من بووم بە قایمقامی قەزای کەلار هاوکات بوو لە گەڵ دنیایەک لە کێشە و گرفت و قەیرانی دارایی و شەڕی داعش بەرۆکی ئەم حکومەتی هەرێمی کوردستانی گرتبوو،کەلار بەشێک بوو لەو کێشانە و هاوسنوربووین لە گەڵ مەترسیەکانی داعش بۆ ناوچەکە و هاتنی لێشاوی ئاوارە بۆ ناوچەکەلە کورد و عەرەبی ناوچەکانی ناوەڕاستی منی بە تەواوی نیگەران کردبوو ،لەو دۆخەدا ویشتم هەرچۆنێک بووە بە دوای زیندوکردنەوەی شکۆ و مێژووی شارەکەمدا بڕۆم. لەپاش دەست بە کاربوونم ڕێک ٢٠١٥\٥\١٥ بوو وەک (٢١)هەمین قایمقامی قەزای کەلار بیرم لەوە کرەوە لەگەڵ فەرمانگە خزمەتگوزاریەکانی تر لە سەر ئاستی قەزا چۆن بتوانین لە پاڵ دابینکردنی خزمەتگوزاریە هەنووکەییەکاندا هیچ نەبێت کۆمەڵێک پرۆژەی بچووک بچووک و پێویست بە گەڕ بخەینەوە لە هەوڵی ئەوەدابووم ،کە بە شێوەیەکی مەیدانی سەردانی فەرمانگەکان و ناو بازاڕ و شەوانیشمان هەبێت بۆ لای کۆمەڵێک لە نووسەر و ڕاگەیاندنکار وکەسایەتی کۆمەڵایەتی سنورەکە بۆ ئەوەی گوێبیستی گلەیی و ڕەخنە و داواکاری و پێشنیارەکانیان بین. هەر لە چوارچێوەی ئەو بەسەرکردنەوانەدا شەوێکی

زستانی مانگی (٢٠١٦\١١) سەردانی ماڵی (مامۆستا مەریوان حاجی حەسەن شاتری)مان کرد, کە ئەوکات پەیامنێری کەناڵی (ئێن ئارتی )بوو .هەر ئەو شەوە بیرۆکەی یادی ڕۆژی کەلارمان باس کرد و وەکو سەرەتایەک. بۆ ئەو مەبەستە بڕیارماندا سەردانی مامۆستا (مستەفا سعید)ی نووسەر بکەین دواتر سەردانی ماڵی شاعیر و نووسەر (ساڵح هەلاج و دکتۆر دارا حەمید و مامۆستا ئەحمەد محمد قادر و کاک ڕامیار بەڕیوەبەری ناحیە)مان کرد بە تێکرا باسمان لەوە کرد کە, کەلار (٤٦)ساڵە بووەتە قەزا و تاکو ئێست یادی ئەو ڕۆژە نەکراوەتەوە کە لە (١٩٧٠\١٢\٢٨)کەلار وەکو قەزایەک بە بڕیارێکی سەرۆکایەتی کۆماری عێراق بە ژمارە(٦٠٨) لە ١٦\ ١١ \ ١٩٧٥ بووە . لەویشەوە باسمان لەوە کرد ئەم شارە تایبەتمەندی ئابوری و سیاسی و کۆمەلایەتی چەند ڕەهەندی گەورە و گرنگی لە خۆ گرتووە وە بووەتە باوان بۆ کۆکردنەوەی هەموو ئەو کوردە ئاوارانەی ناوچەکانی تر بە هۆی هەڵکەوتە جوگرافیەکەی, کە ناوەندی زۆربەی شارەکان دەبەستێت بە یەکەوە بە شانازیەوە توانیمان لە گەڵ کۆمەڵێک هاوڕی خۆبەخش یادی (٤٦) و (٤٧) و(٤٨) ساڵەی ڕۆژی کلار بکەینەوە .

کۆمەڵێک پێشنیار و داواکاری خەڵک و لایەنی مێژوویی و ئابوری ڕۆشنبیری و مەدەنی ئەم شارە باس بکەن ,سەرباری بەردەوامبوونی قەیرانی دارایی و گرفتی مووچەی فەرمانبەران و میلاکات و بایکۆت و خۆپیشاندانی مامۆستایان و فەرمانبەران ئێمە بەردەوام بووین لە خزمەتکردن بەم شارە خۆشەویستە .

ئەوەی شایانی باسکردنە لە یادی (٤٧) ساڵەی یادی بە قەزابوونی کەلاردا بە یەکێک لە دەستکەوتەکانی یادەکە دەتوانین بژمێردرێت سەردانی جێگری سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ کەلار بووە کە بەشداری ڕاستەوخۆی هەبووە لە ڕۆژی کەلاردا لە گەڵ کۆمەڵێک لە وەزیرەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا ,لە وتاری قایمقامیەتی قەزای کەلاردا کۆمەڵێک پێشنیار و داواکاریمان خستەڕوو بە سوپاسەوە بەڵێنی جێبەجێکردنمان وەرگرت هەر ئەو ڕۆژە لەوانە تەواوکردنی بەشێک لە پرۆژە ستراتیژ و گرنگەکان کە بە هۆی قەیرانی داراییەوە ڕاوەستابوو لەوانە(شەقامی پشتێنەی کەلار _شەقامی پێباز _ کەلار _تەواوکردنی پردی گردەگۆزینە

_خانەقین و نۆژەنکردنەوەی ئاوی گەڕەکی فەرمانبەران و دوو قوتابخانەی هەژدە پۆلی و بینای پاسپۆرتی گەرمیان ..............هتد

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین یادی ڕۆژی کەلار خستنەڕووی مێژووی دروستبوونی ئەو شارەیە لە گۆندێکەوە لە ماوەیەکی کورتی زەمەنیدا بووەتە گەورەترین قەزا لە سەر ئاستی هەرێمی کوردستان و گەشەیەکی گەورەی کردووە لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و خانووبەرە و وەبەرهێنان و گەشتیاری و ئابوریەوە و بووەتە خاوەن زانکۆی گەرمیان، قەزاکە ئێستا وەکو ناوەندی ئیدارەی گەرمیان دەناسرێت و ساڵانە لە ڕۆژی کەلاردا باسی گرنگی و بایەخی ئەم شارەمان کردوە تاوەکو لە دەرەفەتێکدا بکرێتە پارێزگای گەرمیان و زۆربەی زۆری ئەو بنەمایانەی تێدا بێت , ئومێدەوارین بتوانین بۆ ئێستا و بۆ ئایندەش ئەم ڕۆژە وەکو یادێک بەرزڕابگیرێت و ساڵانە یادی ڕۆژی کەلار بکرێتەوە.



# کەلار و دەوروبەری لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوەمێژووییەکاندا (١٨٠٠-١٩٠٠ز)


پ.ی. خالد محمود کریم
بەشی زانستە کۆمەڵایەتییەکان-
زانکۆی گەرمیان



**کورتەی توێژینەوە:**

کەلار ناوێکی نوێیە بۆ ناوچەیەکی دێرین و مێژوویی، قۆناغە جیاجیاکانی ئەو مێژووە بەگشتی، تا دەگاتە ڕۆژگارەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی(١٩١٤-١٩١٨ز)، نارۆشن و تەمومژاویی و قسە لە سەرنەکراوە، لە هەندێ زانیاری سەرەتایی زیاتر شتێکی ئەوتۆی لە بارەوە نازانین! بەگوێرەی بەڵگە شوێنەوارییەکان، هەروەها سەرەداوی هەندێ زانیاری نێو سەرچاوە مێژووییەکان، ناوچەکە ڕیشەیەکی گەلێک مێژوویی و دێرینی هەیە. بەڵام ئەم ناوچەیە لە ڕووی کۆنە ناسی و لێکۆڵینەوەی مێژووییەوە، کە لە میانەیەوە هێڵە گشتییەکانی مێژووی قۆناغەکانی پێشووتری ڕوونبکاتەوە، تا ئێستا کەنارێکی پشتگوێخراوبووە و تیشکێکی ئەوتۆی نەخراوەتەسەر، لە کاتێکدا لەم ڕووەوە شایستەی لالێکردنەوەی تایبەتە.

ئەم توێژینەوە هەوڵێکی سەرەتاییە، بۆ تیشکخستنە سەر ئەو نارۆشنی و تەمومژاوییەی لە مێژووی ناوچەکەدا هەیە لەو دیو ڕۆژگارەکانی سەدەی بیستەمەوە، بەتایبەتیش سەدەی نۆزدەهەم، هەڵبەتە لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە کۆن و بەڵگە شوێنەوارییەکان، هەروەها سەرچاوە مێژوویی نوێیەکاندا. تیایدا دەیسەلمێنین پێش دامەزراندن و پەرەسەندنی گوندی کەلاری کۆن، کە بووەتە بناغە بۆ کەلاری ئەمڕۆ، ناوچەکە لە سەدەی نۆزدهەم دا بە «شێروانە» ناسراوبووە، گوندێکیش بەو ناوەوە، لەدیوی باشووری قەڵاکەی ئەمڕۆدا هەبووە.

## دەستپێك

ئێمە لە میانەی بەڵگە شوێنەوارییەکانەوە دەزانین، کە ژیان و ئاوەدانی لە کەلار و دەوروبەریدا، ریشەیەکی مێژوویی دووروودرێژ و دێرینی هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ چاخەکانی فەرهەنگی حەلەف لە هەزارەی شەشەمی پێش زایین، هەڵبەتە دەکرێ گریمانەی زۆر کۆنتر لەو مێژووەش بۆ بوونی ئاوەدانی و ژیان لە ناوچەکەدا بکرێت. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە، نە لە کنە و پشکنینە سەرەتاییەکاندا سەبارەت بەمێژووی دێرین، نە لە سەرچاوە مێژووییەکانیشدا دەربارەی مێژووی قۆناغەکانی دواتر، تا دەگاتە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم، هیچ ئاماژەیەک بۆ ناوی مەڵبەندێکی ئاوەدان لەم ناوچەدا نابینینەوە، کە بووبێتە بناغە بۆ ئەو ئاوەدانییەی، کە لە قۆناغەکانی دواتردا بە کەلار ناوبانگ دەردەکات.

وەک دەزانین کەلار ناوێکی نوێیە بۆ مەڵبەندێکی کۆنتر، ناوەکەی لە گوندێکی ناوچەکە وەرگرتووە، ئەویش گوندی «کەلاری کۆن»ە، کە لە ئەمڕۆدا گەڕەکێکی شارەکە پێکدێنێت. بەگوێرەی یادگەی لۆکاڵی سەرەتای دامەزراندنی ئەم گوندە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم، بەڵام تا ئێستا نەتوانراوە بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوە مێژووییە باوەڕپێکراوەکان، دامەزراندن و درووستبوونی ساغبکرێتەوە. بۆیە سەبارەت بە مێژووی ئەم گوندە هەروەها ئەو ناوچەی کەلارو دەوروبەری لەخۆدەگرێت، بێجگە لە کەمەکێک زانیاری سەرەتایی و ڕاگوزەر هیچی تر لەبارەی ڕۆژگارەکانی ئەو دیو سەدەی بیستەمییەوە نازانرێت! ئەو کەمە زانیارییە ڕاگوزەرەیش کە هەیە پشت بە یادگەی لۆکاڵی دەبەستێت، تا ئێستا هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی ڕوون و پشتڕاستی نەکردوونەتەوە. نەبوونی زانیاری مێژوویی و سەرچاوەی پێویست، وایکردووە مێژووی ناوچەکە بە لێڵی و تەمومژاوی بمێنێتەوە.

پرسیارەکە ئەوەیە، بۆچی ئەم مەڵبەندە ئاوەدان و پڕ ژیانە، بەراورد بەشوێنەکانی تری دەوروبەرمان، زانیارییەکی ئەوتۆ لە بارەی ڕۆژگارەکانی ئەو دیو سەدەی بیستەمییەوە نازانرێت؟ دیوێکی ئەم پرسیارە بە بڕوای تۆژەر پەیوەندی بەوەوە هەیە، کە هێشتا کنەو پشکنینی ورد بۆ ناوچەکە نەکراوە، لە کاتێکدا تێکڕای ناوچەکە دەوڵەمەندە بە سامانی شوێنەواریی.

بەدیوێکی تردا ناوچەکە نەکەوتۆتە سەر هیچ کام لەو هێڵانەی دەچوونەوە سەر مەڵبەندە ئاوەدانانەکانی دەوروبەری، بە تایبەتی لە مێژووی نوێدا. بۆ وێنە، کفری کە کەوتۆتە ڕۆژئاوای کەلار، دەکەوتە سەر هێڵێک، کە لە سلێمانییەوە دەڕۆیشتەوە سەر بەغداد (سلێمانی قەرداغ- سەگرمە-ئیبراهیم خان لە باکوور، قەرەتەپە-دەلی عەباس- بەغداد لە باشوور). یان خانەقین لە باشووری ڕۆژهەڵاتی کەلار، وێڕای ئەوەی کەوتۆتەوە سەر ئەو هێڵە سەرەکییەی میسۆپۆتامیای

بە ناوچەکانی ئێرانەوە گرێدەدا، لە هەمان کاتدا هێڵێکی تری هاتوچۆی مامناوەند، کە بە ناوچەکانی مەیدان و دەشتی شێخان و چەمی دەربەندا تێپەڕدەبوو، دەیبەستەوە بە دەشتی شارەزوور هەورامان و پێنجوێن. بوونی ئەو ناوچانە لەسەر ئەو هێڵانە کە ئاماژەمان بۆ کرد، وایکردبوو گەشتەوەر و گەڕیدە بیانییەکانی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم بەتایبەت پیاگوزەربکەن، لەو ڕێگەشەوە هەندێ زانیاری، ئەگەر کەمیش بووە، لە بارەیانەوە تۆماربکرێت. بۆیە دەبینین ئەو ناوچانە بەراورد بە کەلاری ئێستاو دەوروبەری، زانیاری زیاتریان لە بارەوە هەیە، بەتایبەتیش لەسەر قۆناغی سەدەی نۆزدەهەم، کە لە نیوەی دووەمی سەدەکە بەدواوە، ئیتر ناویان وەک ناحیەو قەزا دەچێتە نێو دابەشکردنە کارگێڕییەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە.

ئەگەر ناوچەیەکی تری نزیک لە کەلار بە نموونە وەربگرین، ئەویش (زەنگاباد) ە، دەبینین هەر لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شانزەهەم بەدوا، لە چوارچێوەی دابەشکردنە کارگێڕییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا، وەک لیوایەک سەر بە بەغداد ناوی هاتووە، بەم بۆنەشەوە هەندێ زانیاری، ئەگەر سەرەتایش بێت، دەرباری بوونی ژیان و ئاوەدانی ئەم ناوچەیە دەزانرێت.

ئەوەی لە بارەی مێژووی ناوچەی کەلارەوە نوسراوە تا ئێستا، زیاتر دەربارەی لایەنەکانی مێژووی سەدەی بیستەم بووە، قۆناغەکانی پێش ئەو مێژووە نەپشکنراوە و بە ناڕۆشنی ماوەتەوە، شتێکی ئەوتۆی لە بارەوە نەوتراوە. لەو بڕوایەوە کە شتێکی ئەوتۆ لە بارەی مێژووی ئەو سەدانەوە نازانرێت، کە کەوتوونەتە پێش سەدەی بیستەمەوە، بۆیە هەر زانیارییەک، ئەگەر کەمیش بووە، پاڵپشت بە زانیاری و بەڵگە شوێنەوارییەکان، یان سەرچاوە ڕەسەن و مێژووییەکان، تیشکێک بخاتە سەر ڕۆژگارە دێرینەکان ناوچەکە، لە ئەمڕۆدا نرخێکی ئێجگار گەورەی دەبێت. ئەم توێژینەوە هەوڵێکی سەرەتاییە بۆ تیشک خستنە سەر ئەو ناڕۆشنی و تەمومژاوییەی لە مێژووی ناوچەکەدا هەیە، لەو دیو ڕۆژگارەکانی سەدەی بیستەم، هەڵبەتە پشتبەست بە بەڵگەو زانیارییە شوێنەوارییەکان و سەرچاوە مێژوویە نوێیەکان.

توێژینەوەکە لە دەستپێکێک و دوو تەوەر پێکهاتووە، تەوەری یەکەم تەرخانکراوە بۆ تیشکخستنە سەر مێژووی کۆنی ناوچەی توێژینەوە، لەبەر ڕۆشنایی بەڵگە شوێنەواری و زانیارییە مێژووییەکان، بۆ ئەوەی لەو میانەوە تیشکێک بخەینە سەر هێڵە گشتییەکانی مێژووە ئاڵۆز و ناڕوونەکەی، هەر لە کۆنەوە تا دەرکەوتنی عوسمانییەکان. تەوەری دووەمیش، تیشکی خستۆتەسەر مێژووی نوێی ناوچەکە، بەتایبەت مێژووی سەدەی نۆزدەهەم، تیایدا پشتبەست بە سەرچاوە مێژووییەکان، دەیسەلمێنین پێش دامەزراندن و پەرەسەندنی گوندی کەلاری کۆن، کە بووەتە بناغە بۆ کەلاری ئەمڕۆ، لە سەدەی نۆزدەهەم دا ناوچەکە بە «شێروانە»

ناسراوبووە، گوندێکیش بەو ناوەوە لە دیوی باشووری قەڵاکەی ئەمڕۆدا بوونی هەبووە.

## تەوەری یەکەم/ کەلار و دەوروبەری لە مێژووی کۆندا لە میانەی بەڵگە شوێنەواریی و زانیارییە مێژووییەکاندا

بەڵگەی شوێنەواری و ئاماژەکان لە کۆنترین سەردەمانی مێژوویی و پێش مێژوویدا هەن، بۆ بوونی سەرچاوەکانی ژیان و ئاوەدانی لە ناوچەی کەلار و دەوروبەریدا. بەڵام بەهۆی ئەنجامنەدانی هەڵکۆڵینی شوێنەواری بەشێکی زۆر لە مێژووی ناوچەکە لەژێر خاکدا ماوەتەوە و ئاستی زانیارییەکان سەبارەت بە مێژووی کۆن و تەنانەت نوێی ئەم ناوچە سنووردارە، لە چوارچێوەی ئەو گەڕان و پشکنینە شوێنەوارییە سەرەتاییانەی لە سنووری کەلار و دەوروبەریدا ئەنجامدراون توانراوە چەندین پاشماوەی شوێنەواری، کە بۆ سەردەمە یەک لە دوای یەکەکان دەگەڕێتەوە بدۆزرێتەوە، کە لە چاخەکانی پێش مێژووەوە دەستپێدەکات تاوەکو دوا قۆناغەکانی سەدە نوێیەکان.(١)

کۆنترین پاشماوەی شوێنەواری لەم ناوچەیە، کە تاکو ئێستا دۆزراوەبێتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی چاخی بەردینی نوێی گڵێنەکاری (Neolithic Pottery) و سەردەمی حەسوونە (٥٨٠٠-٥٥٠٠پ.ز)، لە گرنگترین ئەو شوێنە شوێنەوارییانەش، کە پاشماوەی فەرهەنگی حەسوونەی لێدۆزراوەتەوە (تەپەی سیروان)ە، گرنگترین دۆزراوەکانیش بریتییە لە پاشماوەی گڵێنەیی کە بە کوالیتێکی نزم درووستکراوە، دیواری گۆزەکان زبرە و تێکەڵە بە پووش و کا، هەروەها دەفر و کۆپەڵەو شان و ملی گۆزەیە.(٢) لە چوارچێوەی کارو چالاکیە شوێنەوارییەکانی ناوچەکەشدا، بەشێوەیەکی دیارو بەربڵاو پاشماوەی گڵێنەی فەرهەنگی حەلەف و بەڵگەی ئاوەدانی و چەندین نشینگە، کە بۆ سەردەمی حەلەف دەگەڕێتەوە دۆزراونەتەوە، یەکێک لەوانە کەوتووەتە دەشتی کانی ماسی لە باشووری رۆژهەڵاتی کەلار.(٣)

بەڕێوبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان-یش لە ساڵی (٢٠١٢ز)، پاش دوو وەرز لە کاری کنەو پشکنین لە «گردی رەحیم» لە شارۆچکەی ڕزگاری لە رۆژئاوای کەلار، چەندین پاشماوەی شوێنەواریی دۆزییەوە، وەک گڵێنەی جۆراوجۆر و بیناسازی، کە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان چاخی فەرهەنگیی، دۆزینەوەکان چەندین شێوازی نەخشی ڕەنگاو ڕەنگ لەخۆدەگرێت، کە لە سەر گۆزەکان دۆزراونەتەوە، لە گرنگترینیان وێنەی چەند مرۆڤێکە لەسەر گۆزەیەک، کە پێدەچێت ئافرەت بن لە کاتی هەڵپەڕکێ دا.(٤) یەکێکی تر لە بەڵگە شوێنەوارییەکان، کە گرنگی مێژووی ناوچەکە پیشاندەدات لە ڕووی ئاستی پێشکەوتنی کاری هونەری و پیشە

دەستییەکانەوە، دۆزینەوەی چەند گۆڕێکە لە یەکێک لە گەڕەکەکانی کەلار (بەردەسووری خواروو)، کە چەند گلێنەو کانزا و مووروویەکی تێدا بوو، مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ چاخی جمدە نصر(٣٠٠٠-٢٨٠٠پ.ز). (٥)
یەکێک لەگرنگترین چالاکییە شوێنەوارییەکان، کە لە ناوچەکەدا ئەنجامدراوە و بەشێکی نادیاری مێژووی کۆنی ناوچەکەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، پرۆژەی ناوچەی سیروان (Sirwan regional project)ە، کە تیمێک لە هەردوو زانکۆی گلاسکۆی بەریتانی و کۆلێجی دارمۆسی ئەمریکیی لە نێوان ساڵانی(٢٠١٣-٢٠١٤ز) پێی هەڵساون، لە دەرەنجامی کارەکانیان دەرکەوتووە گەرمیان بەگشتی و ناوچەی کەلار بەتایبەت یەکێک بووە لە ناوچە گرنگ و دیارەکانی سەردەمی برۆنزی-Bronz Age (٢٥٠٠-١٢٠٠پ.ز)، چەندین نشینگەی شوێنەواری تۆمارکراوە، کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دووەمی پێش زایین.(٦)
زانارییە مێژوویییەکانیش گرنگیی و پێگەی ستراتیجیی ناوچەکە لەم قۆناغەدا دەسەلمێنن، چونکە کەلار و دەوروبەری، وەک بەشێکی گرنگی خوارووی گەرمیان(٧)، بەحوکمی نزیکی لە ناوەندی دەوڵەتە یەک لە دواییەکەکان، کە لە میسۆپۆتامیا سەریانهەڵدەدا وایکردووە هەمیشە گۆڕەپانێکی گەرمی بەشێکی زۆر لەو چالاکییە سەربازییانە بێت کە لە نێوان ئەو دەوڵەتانە و گەلانی ناوچەکە یان هەر هێزێکی تر بەرپابووە. بەگوێرەی لێکۆڵینەوە مێژوویییەکان، بۆ یەکەم جار کە لە مێژووی نوسراودا ئاماژە بۆ ئەم ناوچە کرابێت، لە سەردەمی بنەماڵەی ئەکەدی (٢٣٣٤-٢٢١١پ.ز)دا بووە، کە یەکەمین بنەماڵەیە سامییەکان لە میسۆپۆتامیا دایانمەزراند، سارگۆنی (٢٣٣٤-٢٢٧٩پ.ز) دامەزرێنەری ئەم بنەماڵیە لە نوسینەکانیدا ئاماژەی بۆ پەلاماردانی «سیمیرووم» کردووە، کە بەگوێرەی «کۆزاد محەمەد ئەحمەد» پێدەچێت شانشینێکی کۆنی ناوچەی گەرمیان بووبێت و پایەختەکەی لە شێروانە بووبێت.(٧)
هەروەها لە یەکێک لە گلێنە مێژوویییەکانیشدا دەرکەوتووە، نەرام-سین (٢٢٥٤-٢٢١٨پ.ز) ی کوڕەزای سارگۆنی ئەکەدی باس لە سەرکەوتنی خۆی دەکات لە چیای خاشمی، کە بەگوێرەی ئاماژەی سەرچاوە نوسراوەکان، چیایەکە دەکەوێتە بەشی باکووری گەرمیان. هەروەها لە چوارچێوەی جموجووڵی سەربازیی گوتییەکاندا دژ بە ئەکەدییەکان، ناوچەکە سەرلەنوێ بووەتەوە گۆڕەپانی جەنگەکانی نێوان ئەو دوو هێزە. لەپاش جێگیربوونی دەسەڵاتی بنەماڵەی سێیەمی ئوور (٢١١٢-٢٠٠٢پ.ز)، بەدیاریکراوی لە ڕۆژگاری دووەم پاشای ئەم بنەماڵەدا بە ناوی شولگی (٢٠٩٤-٢٠٤٧پ.ز)، بەشێوەیەکی ڕێکخراوو بەرنامە بۆداڕێژراو گەرمیان وێران و کاولکراوە. چونکە لەسەر ڕێگای هەر لەشکرێک بووە، کە ئامانجی پەلاماردانی ناوچەکانی باکوور بووە.(٨)
توێژینەوەکان ئەوە ڕووندەکەنەوە کە

«سیمیرووم» له ڕۆژگاری پاش ڕوخانی بنەماڵەی سێیەمی ئوور له (٢٠٠٤پ.ز)دا بووەتە شانشێکی وا بەهێز، کە هەژموونی بەسەر بەشێکی گەورەی ناوچەکەدا سەپاندووە، نوسینە مێژووییەکان ئەوە ئاشکرادەکەن، کە شەڕێکی قورس لە نێوان سیمیرووم لەلایەک و سیماشکی و ئامووریيەکان لە لایەکی ترەوە بەرپابووە، ئامانجی شەڕەکە دەستبەسەراگرتنی ناوچەی گەرمیان بووە تاوەکو شەپۆلێکی کۆچهێنی ئاموری، کە لە بیابانەکانی ڕۆژئاواوە هاتبوون لە ناوچەکەدا نیشتەجێبکرێن.(٩)

لە سەردەمی بابلی کۆن (دەوروبەری ١٧٦٣-١٥٩٥پ.ز)دا دەوڵەتی سیمیرروم دەسەلاتی لاوازدەبێت، لاوازبوونیشی هاوکات بووە لەگەڵ دەرکەوتنی دەوڵەتێک لە ناوچەکانی دیالە، کە بە»ئێشنوننا» ناسراوە و «تەل ئەسمەر»ی ئێستا ناوەندەکەی بووە. لە ڕووداوەکانی ناوچەکە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پادشای ئێشنوننا «ئیبیق ئەدەد-ی دووەم» ئاماژە بۆ فراوانبوونی ئەو شانشینە بەرەو ناوچەکانی گەرمیان هەن، لەگەڵ ئەوەشدا لەم قۆناغەدا گوتییەکان لە گەرمیان و دەوروبەریدا خاوەن دەسەلات و پێگەیەکی گرنگ بوون.(١٠)

یەکێک لە دیارترین شوێنە شوێنەوارییەکانی ناوچەکە قەڵای شێروانەیە، لە کنەو پشکنینە سەرەتاییەکانی ساڵی (١٩٨٨ز)دا، بۆ هەردوو گردی یەکەم و دووەمی قەڵاکە ئەوەیان دەرخستووە، کە گردەکان شوێنی نیشتەجێبوون بووە لە چەندین سەردمی جیاوازدا، لەوانە لە پاشماوەی سەردەمی برۆنزییەوە تا سەردەمی ئیسلام.(١١) بەهۆی بەریەککەوتنی چینەکانی خوارەوەی قەڵاکەش لەگەڵ تەوژمی لافاودا لە باران لافاوەکەی ساڵی (٢٠١٢ز) چەندین پاشماوەی گڵێنەیی و کانزا دەرکەوتوون، کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگارەکانی (١٨٠٠-١٦٠٠پ.ز).(١٢) بە بڕوای ئالتەوویل و هاوڕێکانی بەهۆی گەورەیی قەبارەی گردەکە و ئەو شوێنە ستراتیجییەی کە لێیەتی پێدەچێت پایتەختە شارێک و ناوەندێکی بەڕێوەبردنی گرنگی یەکێک لە شانشینە دیارەکانی ناوچەکە بووبێت، لەوانە سیمیرووم یان لولوبووم وە یان نیقوم.(١٣)

یەکێک لە دۆزینەوە شوێنەوارییەکان، کە قۆناغێکی تری مێژووی دێرینی ئەم ناوچەیە دەخاتەڕوو، ئەو پاشماوە شوێنەوارییانەیە، کە لەنموونەیەکی بچووکی گردەکەی ژێر بازاڕی سەنتەری شاردا دۆزرانەوە، لەوانە چەندین جۆر گڵێنەو بەردو گۆڕ بوون، کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی نێوان سەدەکانی (١٦٠٠-١٤٠٠پ) واتا سەردەمی کاشییەکان.(١٤) هەروەها دۆزینەوە شوێنەوارییەکانی تەپەی کەلان)ە کە دەکەوێتە باشووری کەلارەوە، پاشماوەی شوێنەوارەکانی ئەم تەپە دەرخەری ئەو ڕاستییەن، کە ئەم ناوچەیە بە درێژایی هەزارەی دووەمی پێش زایین تاوەکو سەدەکانی ناوەڕاست بە بەردەوامی جێگەی ژیان و ئاوەدانی بووە، هاوکات هەڵکۆڵینە شوێنەوارییەکانی کانی ماسی لە ڕۆژهەلاتی شاری کەلار و ئەو پاشماوانەی

که لێی دۆزراونەتەوە ئەوە دەردەخەن، کە لە ناوەڕاست و کۆتایی چاخی برۆنزدا، کەلار و ناوچەکە مەڵبەندێکی گرنگ بووە و پێدەچێت پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان نشینگەی کانی ماسی و قەڵای شێروانە و تەپەی کەلان هەبووبێت، بەو پێیەی لێکچونێک هەیە لە نێوان هەرسێ نشینگەکەدا، لە جۆرو شێوازی پاشماوە شوێنەوارییەکاندا. پێدەچێتیش سەر بە شانشینێکی گرنگ و بەهێزی ناوچەکە بووبێتن لە هەزارەی دووەمی پێش زاییندا. (١٥)

لە سەردەمەکانی دواتردا، سەردەمی سلوکی (٣١٢-٦٤پ.) و ئەشکانی-پارتی (٢٤٧پ.ز-٢٢٤ز) زانیارییەکان زۆر کەمتر دەبنەوە، بەگوێرەی کتێبەکەی (کلینی) کە تایبەتە بە جوگرافیای جیهانی کۆن، ئیمپراتۆریای ئەشکانی لە هەژدە شانشین پێکدەهات، پانزدەیان لە شانشینەکانی «سەروو» و حەوتیان شانشینەکانی «خواروو» بوون، پێدەچێت ناوچەی کەلار و دەوروبەری وەک بەشێک لە گەرمیان، کە بەزمانی پەهلەویی ئەشکانیی ئەو ڕۆژگارەش هەر گەرمیکان-ی پێ دەوترا، لەچوارچێوەی شانشینەکانی خواروودا بووبێت.(١٦) دۆزینەوە شوێنەوارییەکان بوونی ژیان و ئاوەدانی ئەم قۆناغە دەسەلمێنن لە گوندی بەرلووت، کە بەچەند کیلۆمەترێک دەکەوێتە باکووری سەنتەری شاری کەلار لە یەک شوێنەوار، لە دوو کاتی جیاوازدا، دوو گۆڕی ژن و پیاوێک دۆزرانەوە، مردووەکان لە نێو تابووتی گڵێنەی شێوە هێلکەیدا نێژراون، لەگەڵ پاشماوەی وەک کانزا و مووروو و مۆری بەردین، کانزاکان بریتیبوون لە جێ ئاوێنەو کلدانی ئافرەتان، مووروووەکان لە بەرد دروستکراون، کە نەخشی جۆراوجۆری ئەندازەیی و ئاژەڵیان لەسەر هەڵکۆڵراوە، مێژووی ئەم گۆڕانە دەگەڕێتەوە بۆ نێوان سالانی (١٣٨پ.ز-٢٢٨ز). لە ساڵی (٢٠١٥ز.)دا لە گردی شێروانە گۆڕێکی تری هاوشێوە دەرکەوت، کە چەند پارچە زێڕێکی شێوە سینەبەندی لەگەڵدابوو مێژووەکەی هاوسەردەمە لەگەڵ دوو گۆڕەکەی گوندی بەرلووت.(١٧)

زانیارییە مێژووییەکان و دۆزینەوە شوێنەوارییە نوییەکان ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن، کە ناوچەی گەرمیان بەگشتی لە ڕۆژگاری ساسانیدا، بەشێکی گرنگ بووە لە هاوکێشە و گۆڕانکارییە سیاسیی و ئابوورییەکان, بەگوێرەی سەربوردەی ڕووداوە مێژووییەکانی سەرەتاکانی سەردەمی ساسانی، یەکێک لە پاشاکانی گەرمیان بەناوی «دومیتانا» کە بە «پادشای کەرخ و سلۆخ» ناوبراوە، پشتگیری ئەو هاوپەیمانێتییەی کردووە، کە ئەردەشیری یەکەمی دامەزرێنەری بنەماڵەی ساسانی، لە دژی ئەردەوانی پێنجەمی دوایین پادشای ئەشکانی پێکیهێناوە. ئەم جۆرە لە ڕۆڵ و پشتگیریکردن و بۆ یەکالاکردنەوەی ناکۆکییە سیاسییەکان لە قۆناغەکانی تری ساسانیدا دووبارە بووەتەوە، کاتێک گەرمیانییەکان لە شەڕو شۆڕەکانی پاش مردنی بەهرامی سێیەم

پشتگیری نارسە(٢٩٣-٣٠٣ز)یان کردووە بۆ هاتنی بۆ سەر تەختی پاشایەتی ساسانی، بەو ئومێدەی بە بوونی فەرمانڕەوایەکی بەهێز و بەتوانا، مەترسی ڕۆمانەکانیان لێ دووربکەویتەوە.(١٨) هەروەها ناوچەکە بەگشتی بەگوێرەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکان، لە ڕۆژگاری ساسانیدا، ڕێی هاتوچۆ بووە لە نێوان تەیسەفون (سەلمان پاکی ئێستا) و شاری شیز، کە شوێنی حەجکردنی زەرەدەشتییە ساسانییەکان بووە، بەشێکی گرنگی ئەو شارێیە بەم ناوچەیەدا تێپەڕیوە، هەر ئەمەشە وایکردووە لەو ڕۆژگارەدا، لەو نێوانەی کەوتۆتە نێوان(خانەقین-کەلار)، بینایەکی ئێجگار گرنگ و گەورە درووست بکرێت، تا هەم قەڵا و هەم ویستگەیەکی گرنگی سەر ڕێگای نێوان ئێرانی ئەو کات و گەرمیان و میسۆپۆتامیا بێت، ئەویش بینای حەوش کوڕووە، کە بینایەکی گەورەی پڕ ژوور و دالان و هەیوانی بە بەرد و قسڵ بونیانراوە.(١٩)

زیادبوونی ژمارەی نشینگەکانیش لە ماوەی دەسەڵاتی ساسانییەکاندا(٢٢٤-٦٥١ز) بەڵگەیە لەسەر بەرەوپێشچوون و گۆڕانێک لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە لە ناوچەکەدا، بەو پێیەی ژمارەیەکی زۆر کەناڵی ئاودێری گەورە تێبینی کراوە، لەوانە کەناڵێکی ئاودێری لە بەرد و قسڵ درووستکراو، کە (چل) کیلۆمەتر درێژە و دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری ساسانییەکان.(٢٠) ئەم کەناڵە ئاودێرییە کە لە یادەوەری لۆکاڵیدا بەجۆگە (گاورییەکە) ناسراوە، پرۆژەیەکی ئاودێری سەرداپۆشراوی ئەندازەییە، بەهۆیەوە لە بەرزاییەکانی گەڕەکی بەردەسووری ئێستای کەلارەوە، لە ڕووباری سیروانەوە ئاوی گواستۆتەوە بۆ دەشتاییەکانی کەلار و دەورووبەری.پرۆژەکە بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی تیمەکەی هەردوو زانکۆی گلاسکۆ و دارمۆس، کە نزیکەی چواردە کیلۆمەتر چوارگۆشەی زەوی کشتوکاڵی بە ئاو داپۆشیوە، بەڵگەیە لەسەر ئاستی بەرزی ڕێبازی ئاودێری پارتی-ئەشکانی(٢٤٧پ.ز-٢٢٤ز) و ساسانی(٢٢٤-٦٥١ز)(٢١) شوێنەوارناسە لۆکاڵییەکان-یش کەلێکۆڵینەوەی مەیدانییان لەسەر ئەنجامداوە، گەورە و گرنگی ئەم پرۆژە پشتڕاست دەکەنەوە و کەناڵەکەیان وەک ئاماژەیەکی گرنگ لە بواری پشتبەستنی مرۆڤ بە گشتوکاڵ ڕاڤەکردووە(٢٢) لەو بڕوایەشدان کەناڵەکە بەڵگەیە لەسەر پێشکەوتنی کاری ئەندازیاری لەو سەردەمەدا، ئەوەش پیشاندەدات کە ڕێژەی دانیشتووانی ناوچەی کەلار لەو ڕۆژگارەدا زۆربووە.(٢٣) بەگوێرەی یەکێک لە شوێنەوارناسەکان لە کوردستانی کۆندا جۆگەی وا گەورە و درێژ لێنەدراوە(٢٤). پرۆژەیەکی لەم چەشنە بە بڕوای تۆژەر، بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە لەسەر زیندوێتی ژیان و سەقامگیری و پێشکەوتنی کشتوکاڵ و ئابووری لە کەلار و دەورووبەری لە ڕۆژگارە کۆنەکاندا.

دوا بەدوای شەڕی (جەلەولا)یش لە ساڵی (١٦ک=٦٣٧ز.)، کە لە نێوان سوپای ئیسلام و یەزدگردی سێیەم(٦٣١-٦٥١ز) پادشای

ساسانی ڕوویدا، کە بە شکستی دەوڵەتی ساسانی کۆتایهات. بەرەی عیراقی سوپای ئیسلام ناوچەی گەرمیان، کە نزیکترین ناوچەیە لە جەلەولاوە کردە بەشێک لە ئامانجەکانیان ئەوەبوو تا دەوروبەری ساڵی (٦٤١ز) تەواوی ناوچەکانی گەرمیان کەوتە ژێر دەسەڵاتیان.(٢٥)

بەداخەوە هەواڵ و ڕووداوەکانی ناوچەکە لە ڕۆژگارەکانی خەلافەتی ئیسلامی، کە کەوتۆتە نێوان ناوەڕاستەکانی سەدەی حەوتەم تا ناوەڕاستەکانی سەدەی پانزەهەم زۆر نارۆشن و تەمومژاوین، بێجگە لە هەندێ کەرەستەی شوێنەواری کەم نەبێت، کە لە چینەکانی سەرەوەی گردی شێروانە دۆزراونەتەوە(٢٦)، تا ئێستا بەڵگەیەکی ئەوتۆی شوێنەواری بۆ ڕووداوو پاشماوەکانی ناوچەکە لەو ڕۆژگارانەدا لەبەردەستدا نییە. بەهەمان شێوە بۆ ڕۆژگارەکانی هاتنی مەغۆل تا دەگاتە ڕۆژگارەکانی دەرکەوتنی عوسمانییەکان لە ناوچەکەدا، لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شانزەهەم.

## تەوەری دووەم/ کەلارو دەوروبەری لە سەدەی نۆزدەهەم لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە مێژووییەکاندا

پێدەچێت ناوچەی کەلار، بەحوکمی نێزیکایەتی جوگرافی سەر بە کفری بووبێت، کە هەر لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شانزەهەمەوە، وەک سەنجەقێکی سەر بە ئەیالەتی بەغدا، ناوی لە دەفتەر دابەشکرنە کارگێڕییەکانی عوسمانیدا هاتووە.(٢٧) لەگەڵ پەرەسەندنی هەژموونی بابانەکانیشدا لە ناوچەکە، لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمەوە، ناوچەی کەلار و ناوەندەکانی دەوروبەری، لەوانە زەنگاباد و کفری، بوونەتە بەشێک لە کەوشەنەکانی میرایەتی بابان.(٢٨) هەر لەو کاتەشەوە بەشێک لە کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەتەکانی جاف لە چوارچێوەی هەوارگۆڕینی وەرزانەی خۆیدا، بەرێککەوتن لەگەڵ بابانەکان، دەشتاییەکانی ناوچەکە و ئەم دیوو ئەو دیوی گوێ چەم سیروان-یان کردۆتە شوێنی زستانە بەهارەی خۆیان.(٢٩) لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی بنەماڵەکانیشیاندا ڕۆژ دوای ڕۆژ، تا گەیشتۆتە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم، هەژموونیان لە ناوچەکەدا زیادیکردووە و بوونەتە جێفشار بۆ عەشیرەتەکانی تر، لەوانە دەلۆ، گێژ، پالانی، وەنایی و هۆمەر ئاغایی، کە کەوتبوونە ناوچەکانی باشوور و ڕۆژئاوای قەزای کەلاری ئێستاوە.(٣٠)

بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان، ئەورەحمان پاشای بابان(١٧٨٩-١٨١٣)، بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی خۆی، توانی کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەتەکانی جاف بکاتە هێزێکی سەربازیی هاوپەیمان و پشتیان پێ ببەستێ، هەر لەو چوارچێوەشدا بۆ دەستهەڵگرتن لە ژیانی کۆچەری، بڕێکی زۆر لەو زەوی و زارانەی کەوتۆتە نێوان پێنجوێن لە باکوور و قزرەبات لە باشوور، پێشکەش کردووە بە هەندێ لە لق و تیرەکانی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە لق و پۆکانی جاف لەسەر ئەو زەوی زارانە جێگربن و بەژیانی کشتکارییەوە سەرقاڵبن، کەچی لە هەمان کاتدا بەشێکیان هەردوو پیشەکەیان دەکرد، واتا کشتکاری و بەخێوکردنی مەڕوماڵاتیش، هەڵبەتە کاریگەری هەوڵەکانی عەبدولڕەحمان پاشای بابان بۆ نیشتەجێکردنی جافەکان لە پاش مردنی بەچەند ساڵێکی کەم هەستپێکراوە، کە چۆن بووەتە مایەی بڵاوبوونەوەی کشتکاری و زۆربوونی گوندو دێهات، بەتایبەت لە ناوچەی شارەزوور.(٣١) بەڵام بەداخەوە هێشتا نازانین، نیشتەجێبوونی هەندێ لە پەل و پۆ کۆچەرییەکانی جاف لە ناوچەی کەلار و دەورووبەری لە بازنەی هەوڵەکانی پاشای باباندا بووە، یان لە قۆناغەکانی دواتردا بووە؟

بەگوێرەی یادگەی لۆکاڵی دەزانین، کە گوندەکانی سەید خەلیل، بەرلووت، شاکەل، کانی چەقەڵ (تازەدێی ئێستا)، کۆکس، ئیبراهیم خان و کەلاری کۆن، لە گوندە ئاوەدانەکانی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم (یان ڕەنگە پێشووتر)ی کەلاری ئەمڕۆو دەورووبەرین، کە بەشێک لە لق و پۆکانی جاف لەوانە: شاتری، عەمەڵە، ڕوغزایی... هتد، هاوڕێ لەگەڵ خەڵکانی تری سەر بە عەشیرەتەکانی ناوچەکە، لەوانە زەنگەنە، گێژ، زەند و پالانی ئاوەدانیان کردۆتەوە. بەڵام هێشتا بەدیاریکراوی نازانرێت ئەو عەشیرەتانە لە چی قۆناغێکی مێژوویدا نیشتەجێبوون و ناوچەکەیان ئاوەدان کردۆتەوە.

پێدەچێت پرۆسەی نیشتەجێبوون لە کەلار و دەورووبەری، لەپاش هەوڵەکانی مەدحەت پاشای والی بەغداد (١٨٦٩-١٨٧٢ز) پەرەیسەندبێت، لە چوارچێوەی سیستمێکدا کە بە « تاپۆ» ناسراوە. بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی دەوڵەتی عوسمانی، کە خۆی لە چارەسەرکردنی پرسی عەشیرەتەکان و دانانی سنوورێک بۆ هەڵگەڕانەوەکانیان و نیشتەجێکردنیان بە مەبەستی ئاسانکردنی پرۆسەی باج وەرگرتن و سەربازگیریی، لە کۆتایشدا کۆتاییپێهێنانی سیستمی عەشیرەتگەری لە ناوچەکەدا.(٣٢) هەر لە چوارچێوەی ئەم سیستەمە نوێیەدا کاربەدەستانی عوسمانیی، لە ساڵی (١٨٧٣ز) دا، زەوی و زارەکانی ناوچەکانی کفری و خانەقین... هتد. یان وەک زەوی و زاری میری بۆ فرۆشتن ڕاگەیاند. (٣٣) ئەوەبوو مەحموود پاشای جاف(٣٤) بە سوودوەرگرتن لە سیستمی تاپۆ و هەژموون و دەستڕۆیشتنی بنەماڵەکەی توانی چەندین پارچە زەوی لە

کەلارو دەوروبەری لە دەوڵەت بکرێت.(٣٥) بەجۆرێک بەگزادەکانی جاف تا ڕۆژگارەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی(١٩١٤-١٩١٨ز) بوونە موڵکداری بەشێک یان تەواوی زەوی و زاری ناوچەکانی: (کەلار، شێروانە، شێخ لەنگەر، کانی چەقەڵ، شێخ تەویل، بەرلووت، سەید خەلیل، گۆبان. هەروەها زەوی زارەکانی قزلڕەبات، دەککە، سەرقەڵا و کۆکس.(٣٦)

هەر لە چوارچێوەی سیستمی تاپۆدا سەرۆکەکانی هەردوو لقی هاروونی و شاتری لە جاف، وەک ڕۆژنامەی زەورا لە ڕێکەوتی (٩/نیسانی/١٨٧٣ز.) ئاماژەی بۆ کردووە، بۆ پێدانی زەوی زار، سەردانی مەڵبەندەکانی حکوومەتیان لە ناوچەکەدا کردووە، وەک لە ڕۆژنامەکەدا هاتووە، لە کاتێکدا کە زەوی زار بۆ نیشتەجێکردنی جافەکان بێبەرامبەربووە، سەرۆکەکانی ئەم دوو لقە بەڵێنیان داوە، لە بەرانبەر ئەو زەوی و زارانەدا کە پێیان دەدرێت بڕە پارەیەک بدەن بە گەنجینەی دەوڵەت، بۆ پیشاندانی ئەو شوێنانەی گونجاوبوون بۆ کشتوکاڵکردن و تاپۆکردنی بەناوی خۆیانەوە کاربەدەستی تایبەتیش دانروان.(٣٧) ڕاپۆرتی ئینگلیزەکان لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا حەزو ئارەزووی ژمارەیەکی دیاریکراوی شاترییەکان بۆ نیشتەجێبوون دووپاتدەکاتەوە، وەک هاتووە ئەوان لە نێوان ناوچەکانی شێروانە و سەید خەلیل و باوەنووردا جێگیربوون، بەتایبەت ئەو لقەی شاتری، کە بە ئیبراهیمی ناسراوە و «مەحموود محەمەد ئیبراهیم « ڕێبەرایەتییان دەکات، کە بەگوێرەی ڕاپۆرتەکە «پیاوێکە بیرمەند، کەم دوو و ژیر».(٣٨).

بڕوای باو مێژووی دامەزراندنی شاری کەلار و پەرەسەندنی دەباتەوە سەر گوندی کەلار کۆن، کە تاوەکو ئەمڕۆ یەکێکە لە گەڕەکەکانی باکووری ڕۆژئاوای شارەکە، تا ئێستا پێمانوایە ئەو گوندە بووەتە بنچینەی دامەزراندی ئەو شارەی کە ئێستا هەیە. (٣٩) بەڵام ئایا تاکە گوندی ئاوەدانی ئەم ناوەندەیە، کە کەلاری لەسەر بونیادنراوە؟ یان ڕەنگە پێش درووستبوونی، یان شان بەشانی درووستبوون و دەرکەوتنی ئەم گوندە، مەڵبەندی تری ئاوەدان لە سەنتەری کەلاردا بوونی هەبووە؟

لە ئێستادا بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە مێژووییە باوەڕپێکراوەکان، دەتوانین تیشکێک بخەینە سەر وەڵامی ئەم پرسیارە. لە ڕاستیدا پێش دابرانی ناوی کەلار بەسەر گوندی کەلار و ناوچەکەشدا، سەرچاوە مێژووییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، وەک شێروانە ئاماژەیان بۆ ناوچەکە و گردی شێروانە و گوندێکیش بەم ناوە کردووە، کە کەوتۆتە دیوی لای باشووری قەڵای ناسراو بە شێروانە.

کۆنترین ئاماژەیەک بۆ بوونی شێروانە وەکو ناوێک لە سەرچاوە مێژووییەکاندا، هێندەی زانیارییەکانی تۆژەر، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٠٦ز)، کاتێک لە چوارچێوەی لێخستن و دەرکردنی میر عەبدولڕەحمان پاشا لە میرایەتی بابان و پەنابردینی بۆ فەتح عەلی شای قاجار(١٧٩٧-١٨٣٤ز)و هێنانی سوپای

ئێران بۆ سەر سلێمانی، عەلی پاشای والی بەغداد (١٨٠٢-١٨٠٧ز) بۆ یاریدەدان و بەدەنگەوەهاتنی داواکاری خالید پاشای بابان، کە خرابووە شوێنەکەی هێزێکی چوار هەزار مەزندەکراوی لە جەنگاوەران، بە فەرماندەی سلێمان بەگی خوشکەزای و کەهییەی خۆی ناردە سلێمانی. خۆیشی بەهێزێکەوە لە (شێروانە) چادرەکانی هەڵدا، لەگەڵ گەیشتنیدا بۆ (شێروانە) هەواڵی شکانی هێزەکەی سلێمان بەگی خوشکەزای لە بەرامبەر عەبدولڕەحمان پاشادا پێگەیشتووە، بەو هۆیەشەوە دووچاری شێواوی و ئەوپەڕی پەژارە بووە. زۆریشی پێنەچووە هەواڵی ئەوەی پێگەیشتووە، کە شازادە عەلی میرزا لە بەرەی (زەهاوە)وە دەستی بە پەلاماردان کردووە، تا (قزڕابات) هاتووە، سەرباری ئەم ڕووداوانەش ماوەیەک لە (شێروانە) ماوەتەوە، بەڵام کە بۆی دەرکەوتووە چیدی ناتوانێ بەوشێوەیە بەردەوامبێت، بڕیاریداوە پاشەکشێی بکات بۆ کفری، پاشانیش بەدڵشکاوی گەڕاوەتەوە بەغدا.(٤٠)

لە ساڵی (١٨٢٠ز)، ئەو کاتەی کلاودیۆس جیمس ڕیچ، لە چوارچێوەی گەشتەکەیدا بۆ کوردستان، سەردانی ناوچەی بنکوورە-ی کردووە. ئاماژەی بۆ شێروانە کردووە، جارێک وەک ناوچەو جارێکیش وەک گردێک، کاتێک دەڵێت: «کە شۆڕبووینەوە بۆ دەشتەکە لە ناو ئەوەی کە بینیمان دیالە (مەبەستی ڕووباری سیروانە) لە دوورەوە پێچی خواردبوو لەلای ڕاستمانەوە، لەگەڵ گردێکی توورەکەڕێژی بەرز لەسەر کەنارەکانی پێیدەوترا شێروانە.. دەشتەکە لەوە دەچوو باش کشتوکاڵی لێکرابێت»(٤١)، کە بێگومان لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕستەی دواییدا، دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین، کە زەوی و زارەکانی نزیک ڕووباری سیروان، نزیک لە قەڵای شێروانەی ئێستا و دەوروبەری، ئاوەدان و پڕ ژیان بووە. چونکە وەک دەڵێت»لەوێدا خاک زاڵبووە بەسەر بەردەلمینە پێچراوەکان»دا، کە هەموو ناوچەکەکانی تری ئەو ناوەی بەچەردیەکی سەیر داپۆشییەوە. ڕیچ هەروەها لە شوێنێکی تری گەشتەکەیدا، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە جافەکان لە چوارچێوەی هەوارگۆڕینەکانیاندا، لە زستاندا لەم بەرو ئەوبەری سیروان، لە نزیک «شێروانە» ڕەشماڵەکانیان هەڵداوە. (٤٢)

شێروانە لە چوارچێوەی شەڕو پێکدادانەکانی نێوان داوود پاشای والی بەغداد و بابەنەکاندا، جارێکی تر وەک شوێنێک ئاماژەی بۆکراوەتەوە. کاتێک داوود پاشا بۆ یاریدەی مەحمود پاشای بابان، لە ئەیلولی ساڵی (١٨٢١ز.)دا هێزێکی سەربازی (هەزارو پێنج سەد سوارەیی و سی تۆپ)، بە سەرۆکایەتی محەممەد ئاغای کەهییە ئەیالەتدا ڕەوانەی زەنگاباد-کۆکس کردووە، لەوێشەوە هاتۆنەتە ئەو شوێنەی پێی دەوترێت (شێروانە)و بۆ ماوەی چل ڕۆژ جێگیربوون.(٤٣)

هنری ڕاولنسون-ی بەریتانی یەکێکی ترە لەو بیانیانەی ئاماژەی بۆ شێروانە کردووە، ناوبراو لە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتدا، دەربارەی

سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران، کە بۆخۆی لە ساڵی (١٨٤٤ز) سەردانی ناوچە سنوورییەکانی کردووە، لەوانە ناوچەی زەهاو، لە میانەی لێکۆڵینەوەکەیدا، دەڵێت» وا هەستدەکەم شێروانە سنووری نێوان بەغدا و سلێمانی پێکدێنێ«. (٤٤)

وەک دەبینین، هەم ڕیچ و هەم سەرچاوەکانی تر، تەنها دەڵێن «شێروانە»، یەکەمیان وەک گردێک، ئەوانیتر وەک شوێنێک ئاماژەیان بۆ کردووە، بەبێ هیچ زانیارییەکی تر. بەڵام محەمەد خورشید پاشای عوسمانی، کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم، بە کارێکی فەرمی سەردانی ناوچەکانی سنووری عوسمانی–ئێرانی کردووە، لەو نێوانەشدا هاتۆتە بنکوورە، وەک گوندێک ئاماژەی بۆ شێروانە کردووە، تەنانەت شوێنەکەیشی دەستنیشاندەکات. ناوبراو لە وەسفی ئەو ڕێگەوبانانەی کە دەچێتەوە سەر شوێنەواری تەپە گاوری، ئاماژەی بۆ ڕێگەیەک کردووە، کە لە بنکوورەوە «دەچێتەوە سەر پردە ڕووخاوەکەی سەر ڕووباری سیروان، لەو شوێنەی، کە بەرامبەر گوندی شێروانەیە». (٤٥)

بێگومان بە ڕەچاوکردن و تێبینیکردنی زانیارییەکانی خورشید پاشا، کە لە چوارچێوەی کتێبی سیاحەتنامەدا، لە کۆتاییەکانی ساڵ (١٨٥١ز) دارێژاوەتەوە ئەوە ڕووندەبێتەوە، کە لە باشووری قەڵای شێروانەدا گوندێک بەناوی (شێروانە) بوونی هەبووە. بە بڕوای ئێمە ئەو (شێروانە)ی کە لە چوارچێوەی ڕووداوەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ئاماژەی بۆکراوە، دەبێت هەمان ئەو گوندی شێروانە بێت، کە لە سیاحەتنامەدا شوێنەکەی بەم چەشنە دیاریکردووە: (بەرامبەر پردە ڕووخاوەکەی سەر ڕووباری سیروان)، کە ئێمە دەزانین شوێنەواری ئەو پردە ڕووخاوە ڕێک کەوتۆتە نێوان گردەگۆزینەو قەڵای شێروانە، لەو شوێنەی کە پردێکی نوێی لێ دروستکراوە، کە تا ئەم دواییانەش شوێنەواری ئەو پردە ڕووخاوە مابوو. بەدیوێکی تردا پێدەچێت بەڵگەی شوێنەواری بوونی گوندەکە بسەلمێنێت، چونکە لەم ساڵانەی دواییدا بوونی شوێنەوارێکی گەورە، لە نزیک گۆڕستانی شێخ عەبدولڕەحمان، نزیک لە پردەکە دۆزراوەتەوە(٤٦)، بەڵام بەداخەوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ هیچ کنەو پشکنینێکی بۆ نەکراوە.

لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە: ئەم گوندە چی بەسەر هات؟ بۆ لە بری پەرەسەندن و گەورەبوون، تەنها ناوەکەی دەمێنێتەوە و تا دەگاتە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، ئاوەدانییەکەی دەبەخشێتە گوندێکی نزیک خۆی، کە ئەویش گوندی «کەلاری کۆنە»؟ لە ڕاستیدا وڵامی ئەم پرسیارە، لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراودا دەبینینەوە. بەگوێرەی میجەرسۆن، گوندی شێروانە، کە کەوتۆتە ناوچەی بەیەکگەیشتنی هەردوو ڕووباری قۆرەتوو و سیروان، لە بەرەنجامی شەڕوشۆڕو ناکۆکییە خوێناوییەکانی نێوان هەردوو عەشیرەتی جاف و باجەڵان(٤٧) دا

بەتەواوەتی کاول و وێران بووە.(٤٨)
بێگومان بەڵگەنامە و سەرچاوە مێژووییەکانی ڕۆژگاری عوسمانی، شەڕو پێکدادانی خوێناوییەکانی نێوان عەشیرەتەکانی کوردستان بەگشتی دەسەلمێنن، بەتایبەتی قۆناغی پاش نەمانی میرایەتییەکان و دەستپێکردنی حوکمڕانی ڕاستەوخۆی عوسمانی. لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەدوا، ئەو حوکمڕانانەی عوسمانی، کە جێگەی میرەکانیان گرتەوە لە ناوچەکە، سەرباری ئەوەی شارەزای بارودۆخی ناوچەکە نەبوون، سەرۆکی عەشیرەتەکانیشیان بۆ دەستەمۆ نەدەکرا، کە لە هەڵپەی ئەوەدابوون، هێندەی بارووودۆخە نوێیەکە ڕێگەبدات، دەسەڵات و هەژموونی خۆیان بسەپێنن. بۆیە ئەو حوکمڕانانە هیچ کێشەیەکی عەشیرەتەکانیان بۆ چارەسەرو بنەبڕنەدەکرا، بەو هۆیەشەوە باری بێ یاسایی و پشێوی بەسەر هەموو کۆنە میرنشینەکاندا زاڵبوو.(٤٩) بەتایبەتیش ساڵانی پاش بەرپابوونی جەنگی ڕووسی عوسمانی ساڵانی (١٨٧٧-١٨٧٨ز)، کە یەکێک لە ئەنجامەکانی کشانەوەی سەرجەم ئۆردوگا سەربازییەکان و جەندرمەی ناوچەکە بوو، کە تاکە هێزی پۆلیسی ڕاستەقینەبوون بەدەست دەوڵەتەوە، بۆ بەرەکانی جەنگ و چڕکردنەوەی هەوڵ و کۆششەکانی دەوڵەت بۆ کۆکردنەوەی شەڕکەر بۆ ڕاژەی سەربازی.(٥٠) ئەمەش بە تەنها نەبووە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی شەڕوشۆڕ و ڕاوڕووتی عەشایەری لە ناوچەکەدا، بەڵکو بۆشاییەکی دەسەڵاتی دروستکرد، کە هەستەکانی لاوازبوون و داڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوچەکەدا بەجۆرێکی بەربڵاو بەهێزکردبوو.(٥١)
سەرچاوە مێژووییەکان و بەڵگەنامەکانی عوسمانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم، بارودۆخی لەڕادەبەدەر شێواوی عەشیرەتەکان لە ناوچەکە و شەڕوشۆڕو ئاژاوە و دەستدرێژییەکانیان بۆ سەر یەکتر دەسەلمێنن. وەک لە یەکێک لەو بەڵگەنامانەدا دەردەکەوێت، بەهۆی ئەوەی زۆرێک لەو عەشیرەتانە، چی کۆچەرییەکان و ئەوانەشی نیشتەجێبوون، بە تفەنگی مارتینی و هاوشێوەکانی پڕ چەک بوبوون، ئەمەش ئەوەندەی تر ناکۆکیی و شەڕو شۆڕی نێوانیانی پەرەپێدابوو. لەو چوارچێوەدا ناوی عەشیرەتەکانی هەمەوەند و تاڵەبانی و ڕوغزاییەکانی جاف و چەندین عەشیرەتی تر هاتووە، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا پەلاماری گوندەکانی ناوچەکە و قافڵە بازگانییەکانیان داوە و ڕووتیان کردوونەتەوە.(٥٢)
بەدیوێکی تریشدا سەرچاوە مێژووییەکان تیشکێکی زۆریان خستۆتەسەر ناکۆکی و پێکدادانە خوێناوییەکانی نێوان عەشیرەتەکان لە ناوچەکەدا، نموونەی شەڕو ناکۆکی نێوان پاڵانییەکان و زەند، لە ناوچەی زەنگاباد، لە ساڵی (١٨٧٨ز)، هەروەها زەنگەنە و هەمەوەند لە ساڵی (١٨٧٨ز)، یان شەڕو ناکۆییە خوێناوییەکان نێوان جاف و لقێکی شاتری (کەرەم وەیسی)،

دوای کوشتنی محەمەد پاشای سەرۆکی لقەکانی جاف، لەلایەن شاترییەکانەوە، لە ساڵی (١٨٨٠ز).(٥٣) پاشان شەڕو ناکۆکی نێوان جاف و هەمەوەند، لە دوای داڵدەدانی هەمەوەندییەکان بۆ کەرەم وەیسییەکانی شاتری.(٥٤) زۆر ناکۆکی و دەستریژی عەشایەری تر، نموونەی شەڕو ناکۆکییەکانی نێوان پالانی و کەرەوی عەرەبی، یان دەستدرێژییەکانی میکایلی بۆ سەر دەوروبەرەکەیان، کە حکومەتی عوسمان بۆ سەرکوتکردنیان سوپای بەکارهێناوە.(٥٥) یان شەڕە درێژ و خوێناوییەکانی نێوان لقەکانی ڕوغزایی و تەرخانی لە جاف و لەگەڵ عەشیرەتی داودە، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ساڵی (١٩١٢ز) بەردەوامبووە و نزیکەی (سەدو هەشتا) کەس لە نێوانیاندا کوژراوە. ئەمانە و بێجگە لە شەڕو شۆڕە نێوخۆییەکانی نێوان لق پۆکانی جاف، لەوانە بۆ نموونە: «شەڕی گامەخڵ»(٥٦)، لە ساڵی (١٨٨٥ز)، لە نێوان میکایەڵی و عەمەڵە و پشتماڵە و شاتری لەلایەک، ڕوغزایی و تەرخانی لەلایەکەی تر.(٥٧)

دواجار بەردەوامبوونی شەڕوشۆڕو تاڵان و بڕۆ و ئاوارەکردنی لە ناکاو کێشەیەکی وەهایان بۆ خەڵکی ناوچەکە خوڵقاند، کە لەگەڵ دیاردەکانی کەم بارانی و گرانی و برسێتی و نەخۆشی و خەرج و باجی جۆراوجۆر و بەرتیل خۆریی کاربەدەستەکانی عوسمانی پێکرا بە تەواوی پرزەو توانایان لە خەڵکی ناوچەکە بڕیبوو.(٥٨) پێناچێ کاربەدەستە باڵاکانی عوسمانیش ئارەزووی جیدییان لە چارەسەرکردنی ڕاستەقینەی دۆخەکە کردبێت، چونکە درەنگ وەخت و پاش داواکاری و بینەو بەردەیەکی درێژخایەن، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم (١٨٩٨ز) دا، توانیان هێزێکی سەربازی ئامادەو گەڕۆک، بە سەرۆکایەتی عەلی ڕەزا بەگ پێکبهێنن، کە پێکهاتبوو لە (٥٠٠) پیادە و (٢٠٠) سوارە و دوو تۆپی چیایی، ئامانجی ئەم هێزە گەڕانەوەی ئاسایش و ئارامی بوو بۆ ناوچەکە و لێدان و تەمبێکردنی ئەو تاقمانەی بەردەوامبوون لە کارو کردەوەی سەرەڕۆییانە، هەر لەو چوارچێوەشدا داواکراوە پەلەبکرێت لە دانانی قایمقامێکی نوێ بۆ قەزاری کفری (کە ئەو کات شێروانە سەر بە کفری بووە)، بەجۆرێک یەکسانبێت بەو گرنگییەی کە هەیەتی، چونکە ناوچەکە وەک لە داواکەدا هاتووە، بووەتە شوێنی جموجووڵی هەموو سەرکێش و سەرەڕۆی عەشیرەتەکان، ئەوەشی بە هەنگاوێکی گرنگ بۆ گێڕانەوەی ئاسایش و ئارامی ناوچەکە داناوە.(٥٩)

بە بڕوای تۆژەر لە دۆخێکی وەها پڕ شەڕوشۆڕو ناکۆکی عەشایەریدا، ڕێی تێدەچێت گوندی شێروانە وێران و کاول بووبێت، چونکە لە ناوچەکانی تری

کوردستاندا نموونەی هاوشێوەمان هەیە، کە لەو جۆرە ناکۆکییانەدا، وێڕای هەبوونی کوژراو لە هەردوولای ناکۆک و تالانکردنی سامان و مەڕو مالاتەکان، سوتاندنی دەیان گوند و خانووشی لێکەوتۆتەوە.(٦٠)

لە بەڵگەنامە و سەرچاوە مێژووییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، هەواڵەکانی شەڕو ناکۆکی نێوان جاف و باجەلان نابینینەوە. (٦١)، بەڵام سەرچاوە لۆکاڵییەکان ئاماژە بۆ بوونی شەڕو ناکۆکی خوێناوی نێوان جاف و لقی جمووری باجەلان دەکەن، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دا ڕوویداوە. بەگوێرەی نووسەری (جموور چین)، کە ژیاننامەی عەزیز خانی باجەلان(؟-١٩٠٣ز)ی (٦٢) نووسیوەتەوە، زیاد لە جارێک شەڕو ناکۆکییەکی قورس و خوێناوی لە نێوان عەزیزخان و جافەکاندا ڕوویداوە، وەک لە گێڕانەوەکانیشیدا دەردەکەوێت، لە یەکێک لەو شەڕانەدا، عەزیز خان هێزێکی دوو هەزار هەژمارکراوی لە جافەکان تێکشکاندووە.(٦٣) بەڵام بەبێ دیاریکردنی شوێن و مێژووی شەڕەکان، بە بڕوای تۆژەر پێدەچێت ناکۆکییەکانی نێوان عەزیز خان و جافەکان لەپاش ڕووداوی پاڵشتکردنی هەمەوەند بۆ شاترییەکان و هەڵاتنیان بۆ قەسری شیرین، لە ساڵی (١٨٨١ز.) دەستپێکردبێت. چونکە بە گوێرەی هەواڵێکی ڕۆژنامەی زەورا، پاش هەڵاتنی جوامێری هەمەوەند بۆ قەسری شیرین، عەزیز خان پاڵپشتیکردووە.(٦٤)

وەک دەزانرێت گوندی شێروانە ڕێک کەوتە ناوەندەی ئەو شوێنەی تیایدا جاف و جموورەکان و باجەلان بەیەک دەگەن، بەتایبەتی لەگەڵ ئەو پێدەشتەی حاکمی کرماشان، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە، سپاردبووی بە عەزیز خان.(٦٥) ئەوەی لە یەکی جیادەکردنەوە تەنها ڕووباری سیروان بوو. لە دۆخێکی وادا سرووشتیە بەهۆی کێبەرکێ لەسەر زەوی زارو لەوەرگاو پاوان و هۆکاری سیاسییەوە، شەڕوشۆڕو ناکۆکی خوێناوی لە نێوانیاندا ڕویدابێت. بەتایبەتی ئەو زەوی زارانەی لقی جمووری تیا دابەشبوبوو، هێشتا ناوچەیەکی جێناکۆک بووە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی قاجاری دا.(٦٦) نوسراوێکی وەزارەتی دەرەوەی ئێرانی قاجاری، کە لە (١٦ی جەمادی ئاخری ١٣١٧ک-٢١ی تشرینی یەکەمی ١٨٩٩ز.) ئاراستەی باڵوێزخانەی دەوڵەتی عوسمانی کراوە لە تاران. پێدەچێت زۆر ڕووی نادیاری کێشەکانمان بۆ ڕوونبکەنەوە. وەک لە نوسراوەکەدا دەردەکەوێت، ژمارەیەک لە لق و پۆکانی جافی مورادی، لەوانە «عەمەڵە و هاروونی و باشکی و بەداخی» گوایە بۆ لەوەرخۆری سنوورشکێنییان کردووە و چوونەتە ناو خاکی ئێرانەوە لە ناوچەی زەهاو، مەحموود پاشای جاف نامەی ناردووە بۆ شێخ جەلال، کە لە گوندی

«سەنگەر» نیشتەجێیە، داوای لێکردووە لەوێ نەمێنێت(٦٧)، وەک لە نوسراوەکەی وەزارەتــی دەرەوەی ئـێراندا هـاتـووە، جافەکان»بە نەمانی کێشەیان لەگەڵ عەزیز خانی باجەلاندا، خەیاڵیان خراپە بەرانبەر قۆرەتوو».(٦٨)

ئەم نوسراوە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە لە نێوان جاف و عەزیز خانی باجەلاندا شەڕ و ناکۆکی هەبووە، بەڵام چارەسەرکراوە، هـەروەهـا ئـەوە ڕوونـدەکـاتـەوە، کە تەنها ڕووبـاری سیـروان گوندی شـێروانەی لە خاکێک جـیـاکـردۆتـەوە، کـە ئێرانییەکان سەرسەختانە تێکۆشاون تا لەژێر دەستی خۆیاندا بیهێڵنەوە و نەهێڵن لق و پۆکانی جاف، کە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوون لێیی سوودمەندبن، بۆ ئەم مەبەستەش، وەک ژاک دومۆرگان دووپاتیکردۆتەوە، ئێرانییەکان سوودیان لە هێزو تواناکانی عەزیز خان وەرگرتووە و بەهۆی ئەوەوە سنـوورەکـانی خـۆیـان سـەقـامگـیرکـرووە، چونکە وەک پارێزەرێکی سنوور، وێڕای ئــەوەی ئـەو کـەس و خـێڵانـەی تـرس و دوودڵـی لێیان هـەبووە، بـەرەو نـاو خاکی عوسمانی دوورخستۆتەوە، چالاکییەکانی خۆیشی گواستۆتەوە بۆ ناو کەوشەنەکانی عـوسـمـانـی و ئـەویـی کـردۆتـە سـەنـتـەری چـالاکـیـیـەکـانـی.(٦٩) هـەڵـبـەتـە نزیکترین شوێنێک کە نێوبراو چالاکییەکانی خۆی تیا ئەنجامدابێت، بـەبـڕوای تـۆژەر ڕێک دیـوی ڕۆژئـاوای سـیـروانـە، کـە گـوندی شێروانەی لێبووە . بۆیە ڕێی تێدەچێت لە ناو فەزای سنورێکی وا پڕ کێشێشمەکێشی سیاسیی و عەشایەریدا، ئەم گوندە، وەک مێـجـەر سـۆن لـە سـەرەتـاکـانی سـەدەی بیستەم (١٩٠٩)دا ئاماژەی بۆ کردووە، لە بەرەنجامی شەڕوناکۆکییە خوێناوییەکانی نێوان جاف و باجەلاندا، بە تـەواوی کاول و وێـران بـووبـێت. بـەجـۆرێـک تـا دەگـاتـە سەرەتاکانی سـەدەی بیستەم، ئـەوەی لە شێروانە ماوەتەوە تەنها ناوەکەیەتی، کە لە چوارچێوەی دابەشکردنە کارگێڕییەکانی دوا ڕۆژگارەکانی عوسمانی(١٥٣٤-١٩١٨ز) و سەرەتاکانی ڕژێمی پاشایەتیدا(١٩٢١-١٩٥٨ز)، وەک ناوچەیەک سـەر بە کفری نـاوی هـاتـووە، ئیتر لـەوە بـەدوا گوندێکی چەند کیلۆمەتری نزیک لە خـۆی، ئەویش گـونـدی «کـەلاری کـۆن»ە، وەک شوێنێک بۆ ژیـان و ئـاوەدانی جێگەی گرتۆتەوە و وردە وردە بووەتە بناغە بۆ ئەو قەزاییەی ئەمڕۆ بە کەلار ناودەبرێت، ناوەکەشی هەر لە ناوی ئەم گوندەوە وەرگرتووە.

## ئەنجام

بەڵگەو ئـامـاژەی شوێنەواری لە کۆنترین سەردەمانی مێژوویی و نیمچە مێژوویی

ئاماژە بۆ بوونی ژیان و ئاوەدانی لە کەلار و دەوروبەریدا دەکەن، کە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی گڵێنەکاری و سەردەمی حەسوونە(٥٨٠٠-٥٥٠٠پ.ز). بەڵگە شوێنەوارىی و زانیارییە مێژووییەکان ئەوە دەسەلمێنن، کە ئەم ناوچەیە یەکێک بووە لە ناوچە گرنگ و دیارەکانی سەردەمی برۆنزی(٢٥٠٠-١٢٠٠پ.ز)، بەهەمان شێوە لە قۆناغەکانی دواتردا، بەدیاریکراوی لە سەردەمی ساسانیدا، کەلار و دەوروبەری زیادبوونی ژمارەی نشینگەکان و گۆڕانێکی گرنگ لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە بەخۆوەدەبینێ، بەتایبەتی کە یەکێک لە گرنگترین و درێژترین کەناڵە ئاوییەکانی کوردستانی کۆنی تیا لێدراوە.

لەگەڵ دەستپێکی مێژووی نوێی و داگیرکردنی بەغداد لە ساڵی (١٥٣٤ز)، لەلایەن عوسمانییەکانەوە، کەلارو دەوروبەری دەبنە بەشێک لە کەوشەنەکانی دەسەڵاتی عوسمانی، لە دوای ئەویش دەسەڵاتی بابانەکان بەتایبەتی لە پاش بەرینبوونی هەژموونیی لە ناوچەکەدا لە سەدەی حەڤدەهەم، هەر لەو کاتەشەوە وردە وردە، تا دەگاتە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم، بەتایبەتیش لەگەڵ دەرکەوتنی سیستمی تاپۆدا، لەنیوەی دووەمی سەدەکەوە، نیشانەکانی پەرەسەندنی ژیان و ئاوەدانی و نیشتەجێبوونی عەشیرەتەکان، بەتایبەتی کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەتەکانی جاف لە کەلار و دەوروبەریدا دەستپێدەکات و ناوچەکە چەندین گوندی ئاوەدان بەخۆوەدەبینێ.

پێش دەرکەوتنی گوندی کەلاری کۆن و دابڕینی ناوەکەی بەسەر ناوچەکەدا، سەرچاوەکان وەک شێروانە ئاماژەیان بۆ ئەم ناوچە کردووە، هەروەها گوندێکیش بەم ناوەوە لە سەنتەری کەلاردا بوونی هەبووە، کە بە گوندی شێروانە ناسراوبوو، بەڵام ئەم گوندە تا دەگاتە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، لە ئەنجامی شەڕوشۆڕ و ناکۆکی عەشیرەتیدا، کە لە دوای داڕووخانی میرایەتی بابان(١٨٥١ز) و شەڕی ڕووس-عوسمانی (١٨٧٨ز.) ناوچەکە دەگرێتەوە، وێران و کاول بووە. بەجۆرێک ئەوەی لە شێروانە ماوەتەوە تەنها ناوەکەی بووە، کە لە چوارچێوەی دابەشکردنە کارگێڕییەکانی دوا ڕۆژگارەکانی عوسمانی(١٥٣٤-١٩١٨ز) و سەرەتاکانی ڕژێمی پاشایەتی(١٩٢١-١٩٥٨ز)، وەک ناوچەیەک سەر بە کفری ناوەکەی ماوەتەوە، ئیتر لەوە بەدوا گوندێکی چەند کیلۆمەتری نزیک لە خۆی، ئەویش گوندی «کەلاری کۆنە»، وەک شوێنێک بۆ ژیان و ئاوەدانی جێگەی گرتۆتەوە.




**دابەشبوونی گوند و خێڵەکان لە کەلار و دەوروبەری لە سەدەی نۆزدەهەم**

سەرچاوە : کاری توێژەر پشت بەستن بە: نەخشەی پاکتاوی ڕەگەزی لە ناوچەی گەرمیان.

# Kalar and Its Surrounding Area in Accordance with the Historical (1900-1800)

Mr. Khalid Mahmood Karim
Social Science Dept, College of Basic Education, Garmian University
Khalid.mahmood@garmian.edu.krd

## Abstract

Kalar is a new name for an ancient area, and it has a vague survey of history since the old (١٩١٨-١٩١٤) ages till the World War I except some preliminary segments of information. According to little clues from the sources, this area has a deeper historical root in a time that it has not been discussed and uncovered in the former times sources in spite of its being a great issue for archive of history.

This study is primary attempt to shed lights on the unclearness of the area›s history before the twentieth century through depending on both old and modern historical documents. And to achieve that, the study consists of an introduction and a couple of sections, the first one tries to elaborate the ancient history of the area via the archeological evidences so that a light must be thrown upon that disputed history, while the second section explains the area in the nineteenth century, and proves the research›s hypothaeses which declares that before the developing of Kalar Kon›s village, there was a village called Sherwana in the south of the citadel and the area was known .Sherwana as well

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١- Glatz, C. and Casana, J., ٢٠١٦. Of highland-lowland borderlands: Local societies and foreign power in the Zagros-Mesopotamian interface.Journal of Anthropological

Archaeology, ٤٤, pp.١٢٧-١٤٧.
بەڕێوبەرایەتی گشتی شوێنەوار و کەلەپوری عێراق (٩٦) نەوەت و شەش گرد تپۆڵکە و شوێنی لە کەلار و دەوروبەری ئەو ناوچەیەکی شوێنەواری دەستنیشانکردووە، بەڵام تا ئێستا زۆر بەکەمی و چەند دانەیەکیان نەبێت، کنەو پشکنینیان بۆ نەکراوە، بڕوانە: أگلس المواقع الاپريه، منشورات المؤسسه العامه للاپار و التراپ، بغداد، ١٩٧٦، خريگه رقم(١٠٤)، محافقه كركوك، قچاو كلار، ناحيه شيروانه.

٢-(Glatz and Cassana, ٢٠١٧: ٥).
حەسونە: ناوچەیەکی شوێنەواریی دێرینە لە میسۆپۆتامیا، نزیکەی (٣٥کم) باشووری شاری مووسڵ، لە یەکەمین قۆناغە فەرهەنگییە ناسراوەکانە، کە دەکەوێتە پێش مێژوو، مرۆڤ پێش(٦٠٠٠)ساڵ پێش زایین لەم ناوچەدا ژیاوە، ماڵی لە قوڕ دروستکردووە، کشتکاری کردووە و گوندی دروستکردووە، دووری نێوان گوندەکان لەنێوان(٢-٥کم) بووە، ئەم شارستانییەتە لەلایەن شوێنەوارناسە عێراقییەکان بە سەرۆکایەتی سیتۆن لوید، لە نێوان ساڵانی(١٩٤٢-١٩٤٤ز) دۆزرایەوە. بڕوانە: گە باقر، مقدمه فی تاريخ الحچارات القديمه (تاريخ الفرات القديم)، گ٢، (بغداد، ١٩٥٥)، ص ص٥٩-٦٠.

٣-Şerifoğlu, T. E, Casana, J, Glatz, C and Haydar, S. M. ٢٠١٦. Initial Results of the Sirwan (Upper Diyala) Regional Project. ٩th ICAANE, Basel. Proceedings V٣. PP (١١٩-١٣٠).
سەردەمی حەلەف: یان فەرهەنگی حەلەف، ئەو قۆناغەیە لە مێژووی میسۆپۆتامیا، کە دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی شەشەمی پێش زایین، ناوەکەی لەو تەپە شوێنەوارییەوە وەرگرتووە، کە دەکەوێتە «حەسەکە»ی ڕۆژئاوای کوردستان، تیایدا یەکەمین شوێنەوارەکانی چاخی بەردینی نوێ دۆزرایەوە، دوای چەندین ساڵ کنەو پشکنین، لە نێوان ساڵانی(١٨٨٩ و ١٩١١ و ١٩١٣ و ١٩٢٧ و ١٩٢٩ز)، لەلایەن زانای ئەڵمانی ماکس فۆن ئۆبنهایم توانرا ڕوخسارە گشتییەکانی ئەم شارستانییەت و فەرهەنگە دەستنیشانبکرێت. بڕوانە: گە باقر، المصدر السابق، ص ص٦١ و ٦٣.

٤-محەمەد عەلی کەریم، مێژووی کەلار لە ڕووی بەڵگە شوێنەوارییەکانەوە، یادی کەلار»بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی قەزابوونی کەلار، (ژمارە ٠-١، ٢٨ی شوباتی ٢٠١٧)، ل ٥.
٥-محەمەد عەلی کەریم، مێژووی شوێنەواری کەلار و دەوروبەری، یادی کەلار، (ژمارە ٢ی شوباتی ٢٠١٨)، ل٢٨.
٦- Glatz and Cassana, ٢٠١٦: ١٣٣.
٧- گەرمیان: واتا ناوچە گەرمەکان، کە ناوچەی کەلار و دەوروبەری بەدرێژای مێژوو بەشێکی بوون، ناوێکی جوگرافی دێرینە، پەتلیمۆس(٨٧-١٥٠ز) لە جوگرافیا بەناوبانگەکەیدا بەگەرەمایۆی –Garamaioi نوسویێتی، دەڵێت شانشینێک بوو ناوەندەکەی

«کەرخا بیپ سلۆک» بوو، واتا کەرکووکی ئێستا، تا هاتنی ساسانییەکانیش هەر بەدەوامبووە، لە مۆنۆمێنتە مێژووییەکەی پەیکولّی دا، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی زاییندا نوسراوەتەوە، «گەرماییەکان» وەک ئاماژەیەک بۆ خەڵکی گەرمیان ناوی هاتووە، لە دەقی جوگرافیاکەی مۆسی خورنی-یش، کە مێژوونووس و جوگرافیاناسێکی ئەرمەنی رۆژگاری ساسانی بووەو دەقێکی بەناوبانگی لەسەر جوگرافیای ئیمپراتۆری ساسانی هەیە، ناوی «گەرمکان»ی وەک یەکێک لە ئوستانە رۆژئاواییەکانی ئێمپراتۆریای ساسانی هاتووە، بە زمانی ئارامی «بێت گەرمێ»یان پێ دەوت، لە قۆناغەکانی دواتردا لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا بووەتە «باجرمێ».: بڕوانە: کۆزاد محەمەد ئەحمەد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام. سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧. هەروەها کۆزاد ئەحمەد،پەیکولّی شوێنەوارێکی گرنگ..دەقێکی لەبیرکراو، ل١٧.

٧-بڕوانە: کۆزاد محمد أحمد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرەتاوە ت ئیسلام، لە چوارچێوەی کتێبی(مێژووی خانەقین، ئامادەکردنی، مامۆستا حەعفەر»فازیل کریم ئەحمەد»، ب١، (سلێمانی، ٢٠١٧)، ل ل ٣٢-٣٣. جێی ئاماژەیە شوێنی سیمیرووم تا ئێستاش جێگەی مشتومڕە، بۆچوونی کۆنتر ئەوەبوو، کە لە دەوروبەری ئالتون کۆپری (پردێ) بووە، دواتریش ئەو بۆچوونە خراپەڕوو، کە شانشینەکە کەتۆتە باکووری رۆژهەڵاتی ئەو بەشەی زنجیرەی حەمرینی نێوان دوو رووباری عزێم و سروان. نوێترین دەستنیشانکردنی سیمیرووم ئەوەی «فراین»ە (١٩٩٧ز)، کە جەرگەی شانشینەکەی خستۆتە ناوچەی دەربەندیخان-شەمێران-ی ئێستا. بڕوانە:

Frane, D.R., ١٩٩٧.on the location of Simurrum Crasing Bonndariesan and Linking Horizans: studies in Honor of Mchael c. Astonr , pp.٢٤٣-٢٦٩.

٨- بۆ زیاتر بڕوانە: کۆزاد محەمەد ئەحمەد، بایەخی خانەقین و گەرمیان لەبەر رۆشنایی سەرچاوە کۆنەکاندا، گۆڤاری ژین، (ژمارە-١پوشپەڕی ٢٠٠٩)، ل ل ٩-١٠.

لە سەرچاوەکاندا هاورێ لەگەل سیمیرروم دا ئاماژە بۆ «کارخار» دەکرێت، کە شولگی لە چوارچێوەی لەشکرکێشییەکانیدا بۆ ناوچەکە هێرشی کردۆتە سەر، لە یەکێک لەو سەرچاوانەدا گریمانەی ئەوە دەکرێت ناوچەیەکی موحتەمەلی شوێنی کارخار نزیک کەلار-ی ئەمرۆیە، پێشیوایە گۆڕانی (ر) بۆ (ل) شتێکی ئاساییەو باقی گۆڕانکارییەکانیش دیسان ئاساین، ئەگەر ئەم دەستنیشانکردنە راستبێت، پێویستە گۆڕانەکە بەم جۆرە بێت: کارخار-کەرخار)(کەلخار-کەلار). بڕوانە: فاچل قەرەداغی، مێژووی دێرینی کوردستان، کتێبی یەکەم، چاپی ئەمازۆن، ٢٠١٧، ل٣٣-٣٤. بەڵام بەگوێرەی «کۆزاد محەمەد ئەحمەد» کارخار، کە لەگەڵ سیموررووم دا زۆرترین لەشکرکێشیان کراوەتە سەر، یەکێک بووە

له شارەکانی سەر ڕووباری ئەڵوەند. بڕوانە: بایەخی خانەقین و گەرمیان لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە کۆنەکاندا، ل ل۹-۱۰.

۹-هەمان سەرچاوە، ل ۱۰

۱۰- کۆزاد محەمەد ئەحمەد، خانەقین و دەورووبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام. سەرچاوەی پێشوو، ل ل۳۸-٤۰.

١١- Glatz and Cassana, ٢٠١٦: ١٣٣

١٢- محەمەد عەلی کەریم ، یادی کەلار، ژمارە(١)، ل ٥.

١٣- Altaweel, M., Marsh, A., Mühl, S., et al., ٢٠١٢. New investigations in the environment, history and archaeology of the Iraqi Hilly Flanks: Sharizor Survey Project ٢٠٠٩–٢٠١١. Iraq, ٧٤, ١–٣٦.

١٤- محەمەد عەلی کەریم ، یادی کەلار، ژمارە (٢)، ل ٢٩.

١٥-(Glatz and Cassana, ٢٠١٦: ١٣٣-١٣٤).

١٦- کۆزاد محەمەد ئەحمەد، خانەقین و دەورووبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام، ل٤٧.

١٧- محەمەد عەلی کەریم ، یادی کەلار، ژمارە (٢)، ل ل ٢٩-٣٠.

١٨- بڕوانە: کۆزاد ئەحمەد، پەیکوڵی شوێنەوارێکی گرنگ..دەقێکی لەبیرکراو، گۆڤاری ژین، بنکەی ژین، (ژمارە ٣ی تشرینی دووەمی ٢٠١١ز)، ل ل١٤-١٧.

١٩- کۆزاد محەمەد ئەحمەد، خانەقین و دەورووبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام، ل ل ٥٠-٥١.

٢٠- Şerifoğlu et al, ٢٠١٤: ١٢٣.

٢١- Glatz and Cassana, ٢٠١٦: ١٣٣-١٣٤

٢٢- محەمەد عەلی کەریم ، یادی کەلار، ژمارە (٢)، ل ٣٢.

٢٣-بەگوێرەی بۆچوونی کەمال نوری مەعروف شارەزا لە بواری شوێنەوار، هەموو ئاماژەکان بۆ ئەوە دەچن، کە پرۆژەکە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی کیسرای یەکەم – کیسرا ئەنوشەروانی ساسانی (٥٣١-٥٧٩پ.ز) ئەنجامدرابێت. بۆ زیاتر بڕوانە: کەمال نوری مەعروف، هەندێک شوێنەواری دێرینی بەر لە مێژوو و مێژووی کوردستان، (سلێمانی، ٢٠١٠)، ل ل٣٥١-٣٥٧.

٢٤-عبدالرقیب یوسف، جێگەی کەلار و سەرەتای ئاوەدانبوونی، لە ئایاری ١٩٥٤، بڵاوکراوەی یادی کەلار، ژمارە (٢)، ل ٣.

جێی ئاماژەیە، ڕێک بەرامبەر ئەو شوێنەی ئەم کەناڵە ئاوییەی لێوە سەرچاوەی گرتووە، بەدیوی لای چەپی ڕووباری سیروان، لە خوار ئەو شوێنەی کە ئاوی قۆرەتوو دەرژێتە ڕووباری سیروان، جۆگەیەکی ئاوی زۆر درێژو گرنگ لێدراوە، بە «باڵەجۆ» ناودەبرێت، جۆگەکە پێدەچێت مێژوویەکی زۆر دێرینی هەبێت، سیاحەتنامەی حدوود- کە لە ناوەڕتستەکانی سەدەی نۆزدەهەم نوسراوەتەوە، وەک جۆگەیەک کە زەوی

و زاره کشتوکاڵییەکانی دەشتی بنکووره «لەدیوی ڕۆژهەڵات و باشووری کەلار» لێی سوودمەندبووه ئاماژەی بۆ کردووه. بڕوانە: خورشید باشا، رحله الحدود بین الدوله العپمانیه و ایران، ت.مصگفی زهران، گ١، (مصر، ٢٠٠٩)، ص ص١٨٩-١٩٠.

٢٥-زرار صدیق نوفیق، کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا (١٦-٦٥٦ک-٦٣٧-١٢٥٨ز)، چ٢، (هەولیر، ٢٠١١)، ل ل ١٣-١٤.

٢٦-بڕوانە: محەمەد عەلی کەریم ، یادی کەلار، ژمارە (٢)، ل ٣٢.

٢٧- بڕوانە: علی شاکر علی، تاریخ العراق فی العهد العپمانی(١٦٣٨-١٧٥٠)، دراسه فی احواله السیاسیه، گ١، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٢.

عوسمانییەکان لەپاش داگیرکردنی بەغدا لە ساڵی (١٥٣٤ز)، ناوچەکەیان لە چوارچێوەی کۆمەڵێک یەکەی کارگێڕیدا دابەشکرد، سەرەتا ئەیالەتی لوڕستان، دواتر ئەیالەتی بەغدا و لە سەرەتاکانی شەستەکانی سەدەی شانزەهەمیشەوە، ئەیالەتی شارەزول (شارەزوور)یان داهێنا، ئیدی لەوە بەدوا قۆناغ دوای قۆناغ و بەگوێرەی ڕووداوەکانی سەردەمە جیاوازەکان، پاشکۆیەتی کارگێڕی ناوچەکانی باشووری کوردستان گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە، ناوی کفری وەک مەڵبەندێک، کە کەلار و دەوروبەری پاشکۆی بوون. لە دابەشکردنە کارگێڕییەکانی عوسمانی سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەم نابینینەوە، تا ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بەدیاریکراوی لە ساڵی (١٢٦٦ک-١٨٥٠ز)، ئەو کات ناوی کفری وەک مەڵبەندێکی سەر بە ئەیالەتی بەغدا دێتەوە ناوان. بڕوانە: فاچل بیات، الدوله العپمانیه فی المجال العربی، دراسه تاریخیه فی الاوچاع الاداریه فی چوو الوپائق والمصادر العپمانیه حصرا(مگلع العهد العپمانی-اواسگ القرن التاسع عشر)، گ١، مرکز دراسات الوحده العربیه، (بیروت، ٢٠٠٧)، ص٣١٥.

٢٨-دیڤید ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، ب١، (سلێمانی، ٢٠٠٢)، ل٧٥.

٢٩- مێجەر ئی. بی. سۆن، چەند سەرنجێک دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، و. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی شڤان، (سلێمانی، ٢٠٠٧)، ل٦٧.

جاف عەشیرەتێکی گەورەی نیمچە کۆچەری بەنێوبانگبوون، بەپێی زانیارییەکانی تۆژەر, کۆنترین ئاماژەیەک بۆ ناوی ئەم عەشیرەتە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی شانزەهەم، کاتێک لە چوارچێوەی دابەشکردنە کارگێڕییەکانی عوسمانیدا لیوای قەڵای هاوار کە سەر بە شارەزوور بووە، لە ساڵی (٩٩١ک-١٥٨٣ز)، سپێردراوە بە «شا وەلی بەگ»، کە بەگوێرەی دەفتەر دامەزراندنەکە, سەرۆکی بەناوبانگترینی تایفەی جاف بووە. کۆنترین خەمڵاندن بۆ ژمارەی ماڵەکانی جاف، پێدەچێ ئەوەی (جیمس بیللی فرەیزەر) بێت، کاتێک لە ساڵی (١٨٣٤ز) بە ناوچەکەدا تێپەڕیوە ژمارەیانی بە (١٠-١٢)هەزار ماڵ

یان ڕەشماڵ خەملاندووە. لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمیشدا (دەرویش پاشا) کۆی لقەکانی «جاف» و ئەو خەڵکانەی لە عەشیرەتەکانی ترەوە هاتوونەتە ناویان، بەنزیکەی (٤١٠٠) ماڵ داناوە، لەوانە (٣٦٥٠) یان جاف بوون و (٤٥٠)ماڵی تریان لە عەشیرەتەکانی تر بوون. ساڵنامەی ویلایەتی (موسڵ)ی ساڵی (١٣١٠ک-١٨٩٢ز)، لقەکانی (میکایلی، شاتری، یزدان بەخشی، روغزایی، گلاڵی، هاروونی، نەورۆڵی، سەدانی، عەمەڵە) ناو هێناوەو بڕوانە: فاچل بیات، المصدر السابق، ص٣٦٥. خالد مەحمود کەریم، دەوڵەتی عوسمانی و عەشیرەتە کوردەکان لە باکوردستانی باشوور،(١٨٦٩-١٩١٤ز)، (سلێمانی، ٢٠١٢)، ل ل٩٥-١٠٤.

٣٠-سی. جی. ادموندز، کرد و ترک و عرب، (بدون سنه و مکان گبع )،ص١٣٢.

٣١- بشیر سعید اسکندر، قیام النقام الاماراتی فی کردستان و سقوگه مابین منتصف القرن العاشر و منتصف القرن التاسع عشر ، گ٢، (السلیمانیه، ٢٠٠٨)، ص١٣٣.

٣٢- بۆ زیاتر بڕوانە: خالد مەحموود، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٦٩-١٧٣.

٣٣- عباس العزاوی المحامی، المصدر السابق، ص١٩.

٣٤-مەحموود پاشای جاف (١٨٤٦-١٩٢١ز): کوڕی محەمەد پاشای کەیخەسرەو بەگی جافە، پاش ڕووداوی کوشتنی باوکی, لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە نازناوی پاشایەتی پێدراوە و چەند ساڵێکیش پۆستی قایمقامێتی هەڵەبجەی پێبەخشراوە، تا مردنی سەرۆکایەتی بەگزادە جاف و بەشێکی زۆری لقە کۆچەرییەکانی جافی کردووە، بۆ زیاتر بڕوانە: عباس العزاوی المحامی، المصدر السابق، ل ٢٧ . مەیجەر سۆن، سلێمانی ناوچەیەک لە کوردستان، و. مینە، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، (سلێمانی، ٢٠٧)، ل ل ١٢٦-١٢٧.

٣٥- بەگوێرەی گێرانەوەی کەریم بەگی جاف، لەو ساڵەدا مەحموود پاشا لە قەڵای شێروانە بووە، والی بەغداد لە ڕێگەی تەلگرافەوە ئاگاداری کردۆتەوە سەردانی بکات، ئەویش لەگەڵ یەک دوو لە کوێخاکانی شاتری دەڕواتە بەغدا، لەوێ والی ئاگادایکردۆتەوە کە حکوومەت مەبەستێتی پەلی کۆچەری جاف نیشتەجێبکات، بۆ ئەو مەبەستەش ئامادەیە بەشێوەی تاپۆ زەوی وزاریان پێببەخشێت. مەحموود پاشا سەرەتا ئەمەی ڕەتکردۆتەوە، بەڵام لە هاتنەوەدا، کە دەزانێت یەکێک لە کوێخاکانی شاتری، کە لەگەڵیدا بوون خزمانی خۆی قایل کردووە بۆ وەرگرتنی زەوی و زار و نیشتەجێبوون، لە کۆتایدا ئەویش پاش پرس و ڕاکردن لەگەڵ محەمەد پاشای باوکیدا، کە دژی نیشتەجێبوون بووە، بڕیار ئەدات بە مەبەستی زەوی و زار کڕین بگەڕێتەوە بۆ بەغدا. بۆ زیاتر بڕوانە: تاریخی جاف، چ١، (بەغداد، ١٩٩٥)، ل ل١٧٢- ١٧٧.

٣٦- بڕوانە: مێجەر. ئی.ب. سۆن، چەند سەرنجێک دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ل٧٢-٧٣.

٣٧- بەگوێرەی گێڕانەوەی گەریم بەگی جاف، کوێخاکانی شاتری سەردانی ئەحمەد بەگی قادر پاشای بابانیان کردووە، کە ئەو کات قایمقامی خانەقینی بووە، بەو پێیەی ئەم بابانییە لە سەرانی جاف دڵگران بووە، بەتایبەت لە محەمەد پاشای جاف ،بەهۆی ئەو پێگە بەهێزەی کە لە پاش داڕووخانی میرایەتی بابانەوە بەدەستیهێنابوو، بۆیە کاری کوێخاکانی شاتری مەیسەر دەکات و تەلەگراف بۆ والی بەغدا دەکات، بۆ ئەوەی زەوی و زاریان بۆ تەرخان بکرێت. بڕوانە: تاریخی جاف، ل٢٠٧.

٣٨-بڕوانە: ڕاپۆرتی: العشائر الكرديه، ت. فۆاد حمه خورشيد، مگبعه الحوادپ، (بغداد، ١٩٧٩)، ص ٨٤.

٣٩- بڕوانە: دەرباز محەمەد، کەلار لە لادێوە بۆ شار، چ٢، (سلێمانی، ٢٠١٠)، ل٣٦.

٤٠- الشيخ رسول الكركوكلي، دوحه الوزراو فی تاريخ وقائع بغداد الزوراو، ت. موسى كاڤم نوس، گ١، (قم، ١٤١٣ هجرى)، ص ٢٩٦.

٤١-بڕوانە: گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان، بەرگی دووەم، و. مینە، چ١، (سلێمانی، ٢٠١٢)، ل ٢٦٢ .

٤٢- هەمان سەرچاوە، بەرگی یەکەم، ل١٣٤.

٤٣- الشيخ رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص٢٩٦.

٤٤- هنری ڕاولنسن، سەرجەمی ئەو پەیماننامانەی بەندن بە کێشەی نێوان تورک و فارس، و. نەزەند بەگی خانی، (گۆڤاری کاروان-خوولی ڕاپەڕین، ژمارە ١١ی ساڵی ١٩٩٤)، ل ١٢.

٤٥- بڕوانە: خورشيد باشا، رحله الحدود بين الدوله العپمانيه و ايران، ت.مصگفى زهران، گ١، (مصر، ٢٠٠٩)، ص ١٩٠.

٤٦-مەجید ساڵح و فایەق ڕەحیم، کەلار لە گوندەوە بۆ شار، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ژمارە (٤٣١ی ڕۆژی ٢٠-٩-٢٠٠١، ل٥.

٤٧-باجەڵان: یەکێکە لە کۆنترین عەشیرەتەکانی ناوچەی گەرمیان، لە دابەشکردنە کارگێڕییەکانی عوسمانی سەدەی شانزەهەم و دواتر بەشێوەی (باجوانلو، باجوان، باجەڵان) نێویان هاتووە، لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شانزەهەم سەر بە ئەیالەتی لوڕستان بوون، کە عوسمانییەکان پاش داگیرکردنی عێراقی عەجەمی لە ساڵی (١٥٣٤ز) لە ناوچەکانی خواروی کوردستان پێکیهێنا، لە دابەشکردنە کارگێڕییەکانی سەدەی حەڤدەهەم و دواتردا، وەک میر عەشیرەتی باجەڵان، کە ناوەندەکەی لە ناوچەی زەهاو بووە، سەر بە ویلایەتی بەغدا بوون، لە پاش بەریەککەوتنیان لەگەڵ شازادە محەممەد عەلی میرزا و دەرکردنیان لە زەهاو، لە ساڵی (١٨٢٠ز) و ناساندنی زەهاو وەک بەشێک لە ئێران، لە کۆنگرەی دووەمی ئەرزەڕووم (١٨٤٧ز)دا، بەیەکجاری پاشەکشێیان کرد بۆ خانەقین و پێدەشتی بنکوورە، بەگوێرەی سەرچاوەکان باجەڵان لەدوو پۆلی سەرەکی پێکهاتووە،( قازانلوو و جموور). قازانلوو پێکهاتووە لە لقەکانی: (حاجی خەلیل، والی ئاغا، عەبدولرەحمان ئاغا). شوێنی نیشتەجێبوونیان لەو پێدەشتی

(بنکوره)یە، سنوورەکەی بەم شێوەیە: لە باکوور و ڕۆژئاواوە ڕووباری سیروان، لە باشوورەوە باوەپلاوی و جەبەل مرواری، لە ڕۆژئاواوە ئاغ داغ . هەرچی جوموور-ە، کە هەندێک پێیان وایە لە سەردەمانێکی زۆر زووەوە سەر باجەلان بوون، بەڵام لەبەر زۆر هۆ لەوانە: نەبوونی زەوی کشتوکاڵی و فشاری ئەفشارەکان لە باجەلان جودابوونەتەوە و عەشیرەتێکی سەربەخۆیان پێکهێناوە: لقەکانی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەم جۆرە بووە: (سەگەوەند، حاجیلەر، غەریبوەند، شێرەوەند، چوارکلاو، مەمەوەند، داودەوەند، جەلیل ئاغا)،شوێنی نیشتەجێبوونیان بەم شێوەیە: لە باکوورەوە جۆباری هەواسان، لە باشوورەوە ڕێگەی قەسری شیرین- کرماشان، لە ڕۆژهەڵاتەوە گردۆڵکەی داری دیوان و بێشکان، لە ڕۆژئاواشەوە ڕووباری سیروان و بەرزاییەکانی ئاغ داغ. بڕوانە: فاچل بیات، الدوله العپمانیه فی المجال العربی، دراسه تاریخیه فی الاوچاع الاداریه فی چوو الوپائق والمصادر العپمانیه حصرا(مگلع العهد العپمانی-اواسگ القرن التاسع عشر)، گ١، بیروت-مرکز دراسات الوحده العربیه، ٢٠٠٧، ص٣٦٥. مێجەر ئی. بی. سۆن، چەند سەرنجێک دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ل٣٥-٤١. محمد علی سلگانی، جغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل کرمانشاهان، ج٢، چ٢، (تهران، ١٣٨١ش)، ص ص٩٩٢-٩٩٥.

٤٨- مەیجەر سۆن، سلێمانی ناوچەیەک لە کوردستان، ل٨٩.

٤٩-بڕوانە: مارتین ڤان برونەسن، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، د.کوردۆ عەلی، بەرگی دووەم، (سلێمانی، ٢٠٠٢)، ل ل١٥٣-١٥٤.

Maria T. Oshea: Trapped between the Map and Reality: Geography and Perceptions of Kurdistan, .٧٧.p.٢٠٠٤-Newyork

٥٠- ج. ج. لوریمر، دلیل الخلیج، القسم التاریخی، ج٤، قسم الترجمه بمکتب امیر دوله قگر، مگابع علی بن علی، الدوحه (د.ت) ص٢١٩٦.

٥١--Gökhan Çetinsaya: Ottoman Administration of Iraq, ١٨٩٠-١٩٠٨, Rout ledge, Newyork, ٢٠٠٦.p.٧٥.

٥٢-بڕوانە: مختارات من کتاب الموصل و کرکوک فی الوپائق العپمانیه، ترجمه، خلیل علی مراد، مگبعه شفان، (السلیمانیه، ٢٠٠٥)، ص ص٧٨-٧٩.

٥٣-بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی هەندێ لەم ناکۆکییەکانە بڕوانە: خالد مەحمود کەریم، دەوڵەتی عوسمانی و عەشیرەتە کوردەکان لە باکوردستانی باشوور،(١٨٦٩-١٩١٤ز)، (سلێمانی، ٢٠١٢)، ل ل٢١٩-٢٣١.

٥٤- پاش کوشتنی محەمەد پاشای جاف، شاترییەکان هەڵاتن و پەنایان برد بۆ لای هەمەوەندەکان، کە لەو ڕۆژگارەدا جوانمێری هەمەوەند سەرۆکایەتی دەکردن، کاتێک هەمەوەند ڕەتیکردەوە شاترییەکان بەدەستەوە بدەن، شەڕێک لە نێوان هەمەوەند و جاف دا لە نزیک گل ڕوویدا، جافەکان لە شەڕەکەدا شکان. تەقی پاشای والی بەغداد (١٨٨٠-

١٨٨٦ز) بۆ پاڵشتی جافەکان لەشکرێکی ڕەوانەی ناوچەکە کرد، شاترییەکان و ژن و منداڵی هەمەوەندەکان بە سەلامەتی ڕەوانەی ناوچەی قەسری شیرین کرا، لە ماوەی دوو مانگدا هەمەوەندەکان شکستیان بەهێزەکان هێنا. بڕوانە: مێجەر ئی. بی. سۆن، چەند سەرنجێک دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٥٧. بۆ وردەکاری زیاتر بڕوانە: سەرتیپ محەمەد ئەمین، هەمەوەند لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی، چ١، (سلێمانی، ٢٠٠٨)، ل ل ٩٦-١٠٦.

٥٥-عباس العزاوی، موسوعه تاریخ العراق بین احتلالین، العهد العیمانی الاخیر(١٨٧٢١٩١٧)، المجلد الیامن، الدار العربیه للموسوعات، بدون مکان و سنه گبع، ص٥٠.

٥٦-گامەخڵ: یەکێکە لە گوندەکانی گەرمیان، سەر بە ناحییەی باوەنووری ئێستا، کەوتۆتە نێوان گوندی هەوارە ڕەقە و ژاڵانی ڕوغزایی لە باکوور و سەرناوە لە باشوور.

٥٧-بڕوانە: تاریخی جاف، ل ل٢٠٤-٢٠٥.

٥٨-بۆ زیاتر بڕوانە: حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، ناوچەی کفری لە نێوان ساڵانی (١٩١٤-١٩٤٥)، لێکۆڵینەوەیەکە لە بارودۆخی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، چ١، (کەرکوک، ٢٠١٠)، ل ل٣٤-٣٥.

٥٩-بڕوانە: مختارات من کتاب الموصل و کرکوک فی الوپائق العیمانیه، المصدر السابق، ص٧٩.

٦٠- یاکوب کەرەتاش، هەوڵە ئاشتەواییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان هۆزە کۆچەرەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری و ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا،و. شەماڵ حەوێزی، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، (ژمارە ٣٢ی ساڵی ٢٠١٥)، ل٤٠٣.

٦١-بەڵگەنامەیەکی نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم، تیشک دەخاتە سەر شەڕو کوشتارێکی جافەکان بۆ باجەڵان، لە چارەکی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا، بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامەیە جافەکان بەفیت و هاندانی خانی سنە هەڵیانکوتاوەتە سەر (عوسمان بەگ)ی میری باجەڵان لە قەسری شیرین، ئاکام عوسمان بەگ و ژمارەیەکی زۆریان لە بنەماڵەی باجەڵان کوشتووە. بەڵگەنامەکە تەنها ئاماژە بۆ ژمارەی قوربانییەکان و ئەو لیژنەیە دەکات، کە بەسەرۆکایەتی قازی بەغداد پێکهێنراوە تا لە شوێنێکی گونجاوی سەر سنووردا لە تاوانەکە بکۆڵنەوە. بەگوێرەی دابەشکردنە کارگێڕییەکانی عوسمانی، لە ساڵی (١٧٠٠ز)، هەردوو لیوای دەرنە و دەرەتەنگ تێکەڵدەکرێن و بەپێشنیاری ئیسماعیل پاشای والی بەغداد، بەشێوەی هەمیشەیی دەسپێردرێت بە عوسمان بەگی باجەڵان. بەبڕوای ئێمە کوشتاری باجەڵانەکان بە فیتی خانی سنە پێدەچێت لە چوارچێوەی ئەو ناکۆکیانەدا بێت، کە لە نێوان عوسمانییەکان و ئێرانی سەفەوی ئەو ڕۆژگارەدا هەبووە، بۆ دەستبەسەراگرتنی ئەو ناوچەیە، چونکە خاڵی بەیەکگەیشتن و سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتی پێکهێناوە و هەردوولای ناکۆک وەک

شوێنێکی ئیستراتیجی لێیان ڕوانیوە. بڕوانە: عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات ووپائقیه فی تاریخ الکورد الحدیپ، گ١، مگبعه الپقافه، (اربیل، ٢٠٠٨)، ص ص ٢٤٨-٢٤٩. فاچل بیات، المصدر السابق، ص ص ٣١٢-٣١٣.

٦٢-عەزیز خانی باجەڵان(؟ - ١٩٠٣): مەبەست «عەزیز خانی جموور»ە، کە لە سەرچاوەکاندا بە عەزیز خانی باجەڵان، یان عەزیز شجاع الممالک ناسراوە، یەکێکە لە سەرۆک و کەسایەتییە دیار و ناسراوەکانی جموور، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم دا، مەسعود میرزا (ڤل السلگان)ی حاکمی کرماشان، وەک پارێزەرێکی سنوور، ئەو زەوی و زارانەی کەوتوتە نێوان هەردوو ڕووباری ئەڵوەن و سیروان پێسپاردووە. کە ناوەندەکەی قۆرەتوو بووە، نێوبراو لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و ساڵانی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، ڕۆڵێکی کارایی لە ڕووداوەکانی ناوچەکەدا هەبووە. بەتایبەتی ئەو ڕووداوانەی کە بەندن بە دەرهێنانی نەوتی چیا سورخ لە سەرەتای ساڵانی سەدەی بیستەم. بۆ زیاتر بڕوانە: مامۆستا حەعفەر، عەزیز خان جموور، (لە چوارچێوەی کتێبی: مێژووی خانەقین، ئامادەکردنی، مامۆستا حەعفەر» فازیل کریم ئەحمەد»)، ب١، سلێمانی، ٢٠١٧، ل ل ٣١٧-٣٣١. خالد محمود کریم، جیاوکی دارسی و هەڵکۆڵین لە چیا سورخ یەکەمین چاڵە نەوتییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان(ژمارە(١٢)، بەرگی سێیەم، ساڵی ٢٠١٧، ل١٨٥-١٨٦. مەزاهر باجەڵان، ئێلی باجەڵان لە سەفەوییەکانەوە تا کۆتایی قاجارەکان، و. جەلیل مورادی و کاروان عوسمان، چ١، (سلێمانی ٢٠١٤)، ل ل٨٧.

٦٣-بڕوانە: مەلا ئەحمەد مەحموود عەلی، جموور چین، لە چوارچێوەی کتێبی (مێژووی خانەقین، ئامادەکردنی، مامۆستا حەعفەر»فازیل کریم ئەحمەد»، ب١، (سلێمانی، ٢٠١٧)، ل ل ٣٤٢ و ٣٦٢.

٦٤- عباس العزاوی، المصدر السابق، ص٧٨. هەڵبەتە ئاگاداری ئەوەین، کە لە ساڵانی داهاتوودا ناکۆکی و ئاژاوە دەکەوێتە نێوان عەزیز خان و جوامێر ئاغای هەمەوەندەوە. بۆ وردەکارییەکان بڕوانە: مەلا ئەحمەد مەحموود عەلی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٤-٣٤٩.

٦٥-بەگوێرەی نوسینەکانی (١٠ی مارسی ساڵی ١٨٩١ز.) ژاک دمۆرگان، دوانزە ساڵێک پێش ئەو مێژووە، دەسەڵاتدارانی ئێران پاراستنی سنووری زەوی و زارەکانی نێوان حەلوان و ڕووباری سیروان-یان داوە بە عەزیز خان، بە پلەی سەرتیپ-ییەوە، لەگەڵ موچەیەکی ساڵانە، کە بڕەکەی شەش تمەن (٤٨٠ فرانک) بووە. بڕوانە: کوردستان لە لێکۆڵینەوەکانی ژاک دومۆرگاندا، و. سعید خچری و ئاسۆ عبدالرحمن، چ١، چاپخانەی گەنج، (سلێمانی، ٢٠١٢)، ل١٢٦.

٦٦- ئەگەرچی بەگوێرەی پەیماننامەی ئەرزەڕۆمی دووەم، لە ساڵی (١٨٤٧ز)، دەبوو ئێران دەست لە زەوی و زارە نزمەکانی بەشی خۆرئاوای ناوچەی زەهاو هەڵبگرێت،

بەڵام لەڕاستیدا ئێران ئەمەی جێبەجێنەکرد. بۆیە سەرجەمی ئەو ناوچانەی کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سیروان، بەدیاریکراوی ئەو زەوی و زارانەی دەکەونە نێوان ئەو ڕێگا سەرەکییەی لە کەلارەوە دەچێتەوە سەر قۆرەتوو و گوندی مەجید سالار تا شاخی بەمۆ لەژێر دەسەڵاتی ئێراندا مانەوە، تا دوای مۆرکردنی پرۆتۆکۆلی ئەستانە لە ١٦ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٣ز) و کۆنووسی دانیشتنەکانی لیژنەی دیاریکردنی سنوور لە ساڵی (١٩١٤ز). ئەو کات وەک بەشێک لە خاکی عوسمانی ناسێنران. بڕوانە ناوەڕۆکی پرۆتۆلەکە لە: عبدالعزیز سلیمان نوار، تأریخ الشعوب الاسلامیه، مصر(بدون تأریخ گبع)، ص ص٦١٥-٦٢٤.

٦٧- پێدەچێت مەحموود پاشا، گوندی سەنگەر (هەروەها گۆڕەشەلە و قەڵاتەپە)ی وەک شوێنی دێرینی لقەکانی سەدانی و بەداخی سەر بەجاف زانیوە، کە هەر لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم (ڕەنگە پێشووترەوە)، کردبوویانە شوێنی زستانە مانەوەی خۆیان. بڕوانە: تاریخی جاف، ل ل ١٦١-١٦٢.

٦٨-وزارت امور خارجیه، مگالعات سیاسی و بین المللی، گزید اسناد ایران و عیمانی دەورە قاجاریە، جلد چهارم، واحد نشر اسناد، چاپ اول(تهران، ١٣٧٠)، ص١٧٠.

٦٩-بڕوانە: کوردستان لە لێکۆڵینەوەکانی ژاک دومۆرگاندا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.



# چۆن پەژاری شاعیرم ناسی

پ.ی.د. دارا حەمید محەمەد
زانکۆی گەرمیان



ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٧ بوو ، تازە ڕژێمی بەغدا تاوانی ڕاگواستنی دێهاتەکانی دەستپێکردبوو ، گەڕەکی( ئیمام محەمەد)ی ئێمەش زەمەنێکبوو بوو بەمۆتەکە بەسەر دڵی بەعسییەکانی کفری و باقوبەوە ، هەمیشە لەهەلدەگەڕان بۆ ڕوخاندنی ، هەر بۆیە ئەو تاوانەی ڕژێم بۆسەر دێهاتەکان ئەو هەلەی بۆ کینەلەدڵانی کفری لە بەعسییەکان و چەند خۆفرۆشێک ڕەخساند و بەپاساوی جۆراوجۆر گەڕەکی (ئیمام محەمەد)یان تەختی زەوی کرد ، ئاخرخۆلە دید و بەپێی پێوەری ئەوان پاساوەکانیان ڕەوابوون ، گەڕەکەکەی ئێمە تەنها تا خۆرئاوابوون دەستی پیاوانی ڕژێمی پێدەگەیشت ، هەرکەشەودادەهات ئیتر بنکەی پیاوانی بەجەرگی شاخبوو، کەم شەوهەبوو پێشمەرگە دانەبەزێتە ناو ئیمام محەمەد ، هەر لەو گەڕەکەشەوە چالاکییەکانی ناوشاریان دەستپێدەکرد و زۆرجار گورزی کوشندەیان لە دوژمن دەدا . ڕژێمیش باش لەو ڕاستییە گەیشتبوو ، بۆیە لە هەلی ڕوخاندنی گەڕەکەکە دەگەڕا ، وەک وتمان ، ئەوەشیان بۆڕەخسا ، بەوتاوانە نزیکەی ٤٠٠ خێزان کە دانیشتووی ئەو گەڕەکەبووین ئاوارەو دەربەدەرکراین ، نیگەرانبووین زۆر نیگەران ، ئەمە سەرباری ئەو نائومێدییەی ڕوویتێکردبووین لە ئەنجامی هێرشی دڕندانەی بەعس و ڕوخاندنی هەموو دیهاتەکانی ناوچەکەمان ، کە دواتریش تاوانەگەورەکانی وەک کیمیابارانی هەڵەبجە و تاوانی ئەنفالی بەدوادا هات . ئێمە ڕوومانکردە

کەلار و لە هەواری نوێماندا گیرساینەوە و نیشتەجێبووین .

کەلار بۆمن غەریبی بوو ، دوورکەوتنەوەبوو لە هاوڕێیانم ، دابڕانبوو لە یادگاری و شوێنی بیرەوەرییەکانم ، ئاخر من هەر لەو گەڕەکەدا لەدایک بووم و جوانترین ساڵانی تەمەنم لەو گەڕەکەدابەسەربرد ، هەموو بستێکی بۆمن مانا و دەلالاتی خۆی هەبوو ، بۆیە قبولکردنی لەپڕ لەدەستچونی ئەو هەموو پیرۆزییە هەروا سانا نەبوو ، بەڕاستی هەستم بە غەریبی دەکرد ، چوون کەسم نەدەناسی ، نە یار نە یاوەر ، کەسم نەبوو تەنها چەند برادەرێکی کەم کە لە زانکۆبەیەکەوەبووین و هیچیتر . بۆیە هەواری نوێمان نەدەچووە دڵەوە .

سروشتی مرۆڤ وایە توانای خۆ گونجاندنی هەیە ، لەبەرئەوە هەرچەندە ڕۆژگاری سەرەتامان لە هەواری نوێدا بە نائومێدی گوزەراند بەڵام وردەوردە ئاشنایەتیمان پەیداکردو دەرودراوسێی گەڕەک و کۆڵان و بازاڕمان هەبوون ، وەلێ بەبەراورد لەگەڵ زێدی خۆم کفری هێشتا ئاسمان و ڕێسمانبوو .

ڕێکەوتێکی خۆش :

ڕۆژێک بەرەو بازاڕ دەرۆیشتم سواری جیبێک بووم (ئەو کاتە تەنها هۆکاری گواستنەوەی ناوخۆیی لەکەلاردا جیب بوو) زۆر حەپەسام ، بینیم گەنجێکی ٣٠ ساڵان بەڵام یەک پارچە لە ورە ، ئیرادە ، بوێری ، قسەزان ، ئەوەی نەدەوترا دەیوت (کوردایەتی ، گیان فیدایی ، خەبات ، کۆڵنەدان ، قوربانیدان ، دوژمنان ....) چەند چەمکێکی ئاشنا بە ڕۆح و بیر و هەستم خەمڕەوێنی بۆ دڵی پڕ لەئازاری دابڕانم لە کفری لە هاوڕێیانی تەمەن و لە جوانییەکانی ، ئەو بەردەوامبوو ، وامدەزانی دڵنەوایی من دەکات و هەموو قسەکانی بۆمنە ، لەناخەوە زۆر هەستم بە ئاسودەیی دەکرد ، بەڵام نەمدەوێرا بیدرکێنم و شتێک بڵێم ، ئاخر ئێمە غەریب بووین حەقمانبوو بترسین ، بەگومان بین ، بۆیە دوای ئەوەی بەوردی گوێم بۆ وتەکانی شلکرد پیرە جێبیش وردەوردە دەجولاو ناوەناوەش بۆماوەیەکی باش دەوەستا تا سەرنشینێک لە کۆڵانێکەوە دەگەیشت ، ئیتر ئەمەش هەلێکبووبۆ بیستنی زیاتری وتەجوانەکانی ئەو گەنجە ، کە یەکمجارە بەدیداری شاد دەبم . بەئەسپایی و زۆر لەسەرخۆ وەک ئەوەی تەنها ئەو گوێی لێبێت ، هاتمەگۆو وتم :

– کاکە قسەکانت زۆر ڕاستن ، قسەی دڵی هەموومانن

گەنجەکە– هیوادارم وابێت ، ئیتر بەسە ترس ، بەسە خۆفرۆشی ، بەسە ملکەچی و بەسە بەسە و.... بەردەوامبوو

– تەنها قسە مەرج نییە کردار گرنگە

گەنجەکە – زۆر ڕاستە کردار گرنگە ، منیش ئەوە دەڵێم پێویستمان بەکردارە ، دوژمن نیازی زۆرخراپە .

– ڕاستە ئەوەتا ئەو هەموو دێهاتەی ڕوخاند و هەموو خەڵکی لە کۆمەڵگادا کۆکردوەتەوە . پێویستە زۆر وریابین ، دەنا خراپمان لێبەسەردێت .

گەنجەکە – بەڵی وایە بەڵام دەبێ بڕوامان بە هێزی خۆمان هەبێت ، بە دڵنیاییەوە هەموو شتێکیشی بۆناچێتەسەر .

– بێگومان ئەم پلانە نەگریسانە چەند جارێکیتر پێش ئەمانە تاقیکراونەتەوە و سەرکەوتونەبوون .

گەیشتینە گەراج

گەنجەکە – من ناتناسم ، خەڵکی کەلاریت ؟ حەزدەکەم بتناسم .

– خۆم پێناساند بەڵام کە وتم خوێندکاری بەشی کوردیم لە زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر هەستم بە ئاسودەیی و گەشانەوەیەکی ئاشکراکرد لەڕوومەتی گەنجەکەدا .

– گەنجەکە – زۆر خۆشحاڵبووم منیش محمد پەژارم شاعیرم و شیعریشم زۆر لە هاوکاری و بەیان .. بڵاوکردوەتەوە بەرنامەشم لەڕادیۆی دەنگی کوردی هەبوو

– زۆر خۆشحاڵبووم . زیاتریش دوای ئەوەی کە زانیم شاعیرە ، ئەوە بۆخۆی دڵنیاییەکی زیاتری پێبەخشیم

– پەژار – حەزدەکەم پەیوەندیمان هەبێت من کتێبخانەیەکم هەیە لە بەرانبەر مزگەوتی ناوبازاڕ کتێبخانەی کوردەواری .

تەواو دڵخۆشبووم چونکە شوێنی ئەو کتێبخانەیەم نەدەزانی و نەشمدەزانی جگە لە کتێبخانەکەی مام سابیر کەلار کتێبخانەی تری تێدایە .

– بێگومان سەردانیت دەکەم خواحافیز

– پەژار – خوات لەگەڵ



ئەم دیدارە کورتەی ناو جێبێک لە نێوان من و پەژاردا دەروازەیەکی بۆ خستمە سەرپشت ، هەربۆیە بۆ ڕۆژی دواتر چومە کۆلانی مزگەوتەکە و بینیم ژمارەیەک کتێب لەسەر چەند کارتۆنێک لەبەر دەرگایەکی بچوکدا ڕیزکراون ، لەسەر دەرگاکەش نووسراوە کتێبخانەی کوردەواری ، زۆر گەورە هاتە پێش چاوم چونکە من لە هەولێر هەرکتێبێکی باش و دەگمەنم بویستایە لەبن دیوارەکانی بن قەڵا یان لای دادگای پشت پارێزگا دەستم دەکەوت بۆیە هەمان ئومێدم بەو کتێبخانەیە و بە خاوەنەکشی پەیداکرد .

ئیتر هاوڕێیەتییەکی نوێ و پڕ بەهام بۆ بنیاتنرا ، قسەو باس بەبێترس ، زۆر جاریش باسی ئەدەبیات و زانکۆ ، سەردانی بەردەوامم بۆکتبخانەی کوردەواری زیاتر ئاشنای پەژاری کردم تا دەهات خۆشەویستی ئەو پیاوە لە ناخمدا گەشەیدەکرد ، ئەفسوس دەستی ڕەشی چەکدارەکانی موجاهەدینی خەلقی ئێرانی لە

بەرواری ٢٥ / ٣ ١٩٩١ لەناو شاری کەلاردا پەژاری شەهیدکرد و دەنگێکی دلێر و پێنووسێکی بوێری میللەتەکەمانی گەیاندە کاروانی نەمران و دەیان خەونی ڕەنگاڵەی لەگەڵدا جوانەمەرگکرد . شیعرەکانی پەژاری جوانەمەرگ بەدەستخۆشییەوە دووجار چاپکراون چاپی یەکەم لەلایەن بەڕێز سەرکۆ محمەد رۆستەم ، چاپی دووەم لەلایەن بەڕێز (پ.ی. ئەحمەد باوەڕ) ەوە .

نمونەیەکی شیعری پەژار:

ورە

گەروتیان ورە

بلێ تا دارگوێزی مابێ

تاوەکو دونیا دونیابێ

خۆری چیای بەرزی ورەم

ئاوانابێ و

ئاوانابێ

******        ********

ڕێ

گەروتیان دلگیرترین ڕێ

بلێ ئەو تولەڕێگەیەی

یاڵەو یال پێچاو پێچ دەخزێ

بۆ کەوسەری کانیاوەکەی

بەهەشتی دێ



# گرنگی دانانی ماستەر پلان بۆ شاری کەلار

میقداد شاکلی
ماستەر لە جوگرافیای شار



## مێژووی سەرهەڵدانی زانستی ماستەر پلانی شار :

دەرکەوتنی زانستی پلانی شار کۆنە هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە درکی پێکراوەو بووە، بەڵام بەشێوەیەکی بەربڵاو و بەرنامە بۆ دانراو دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، ئەویش بە هۆی شوێنەواری وێرانبوونی شارە ئەورووپیەکانەوە، لەبەر سەرهەڵدانی جەنگی جیهانی دووەم. ئەو پلانەش تەنها بۆ چاککردنی شوێنەواری جەنگ نەبوو، بەڵکو بووە یەکێ لەو کلیلانەی کە دەرگای زۆر گیرو گرفتی شارەکانی ئەورووپای داخست، وەکو گیروگرفتی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و خراپ بەکارهێنانی زەوی و زار بۆ کەرتەکانی « پەروەردەو تەرفیهی و نیشتەجێبوون و ڕێگاو بان و پیشەسازی و تەندروستی و زۆری تر » .

## پێناسەی پلانی شار :

پلاندانانی شار واناسراوە، کە تێکەڵەیەکە لە زانست و لە هونەر، کە ئامانجیان ڕێخکستن و جوانترکردن و گەیشتنە بە شێوازێکی زانستی و سەردەمیانەی شار بە بێ کێشەیەکی ئەوتۆ، لەتەک ئەوەشدا ڕێکخستنی ڕێگاو بان و شەقامەکان کە بە شادەماری شارەکان دادەنرێت، یەکێکە لەو سوودە گەورانەی کە زانستی پلاندانان پێشکەشی شاری کردووە، هەروەها دیاریکردنی شوێنی گونجاو بۆ چالاکی جۆراو جۆر لە چوار چێوەی شاردا، بە جۆرێ کە دڵنیایی و متمانە بداتە هەست و نەستی دانیشتوانی شار، بە جوانی و دیمەنی سەرنج ڕاکێشیەوە .

## گرنگی پلاندانان بۆ شار :

ئامانجی پلاندانانی شار، بریتیە لە کۆمەڵێک بابەتی گرنگ وەکو :

١. هێنانەدی ئارەزووە تایبەتمەندیەکانی خەڵک لە چوار چێوەی یاسادا .

٢. چارەسەرکردنی کێشەگەلێکی جیاواز لە ناو شاردا، وەکو گواستنەوە و گەیاندن و کەرتی نیشتەجێبوون و سەرجەم کەرتە خزمەتگوزاریەکانی تر .

٣. پێدانی سیمای جوان بە شار، چ لە ڕووی باڵەخانەو ڕێگاو بان و ترافیک و پردەوە بێ، یان لە ڕووی ڕێژەی سەوزای و پارک و شاری یاری و گۆم و دیمەنی ئاڵاو واڵای ترەوە بێ .

٤.کەرتی وەبەرهێنان برەو پێئەداو چارەسەری زۆر لە گیروگرفتەکانی دانیشتوانی شار ئەکات .

٥. بەکار هێنانی زەوی بە شێوەیەکی گونجاو و ڕێکخراو و زانستی .

٦. هاوبەشی کردن لە کەمکردنەوەی ڕێگای دوور و بێزار کەر، بۆ ئەوەی دانیشتوانی شار بە ئاسانی بتوانن بگەنە هەموو ناوچە جیاوازەکانی شار .

## ئامانجی پلاندانانی شار « ماستەر پلانی شار » :

بە گوێرەی زەمان و شوێن، داواکاریەکانی دانیشتوانی شار لەتەک یەکدیدا ئەگۆڕێن، داب و نەریت و کەلتووریش ڕۆڵی گەورەیان لەم پرۆسەدا هەیە، بە جۆرێ کە کۆمەڵێک بابەت و شمەک و داواکاری بنەڕەتی هەیە لە ژیانی کۆمەڵگەی شارنیشیندا، وەهەر کاتێ ئاراستەی جیاواز و بایەخپێدانی زۆر و زەبەن هاتە گۆڕێ، ئیدی ڕێژەی کێشەو گرفتەکانیش دەدەن لە زیادی، هەر بۆیە لێرەدا ڕۆڵی پڕ بایەخی پلاندانان دێتە ناوەوە و دەست بۆ گشت بابەتە هەستیارەکان دەبات و بە تێڕوانینێکی دوور مەوداو پڕ لە چارەسەرەوە بۆی ئەڕوانێ و هەموو ئەو تەنگ و چەڵەمەیە، کە سەرو دڵی شار و دانیشتوانەکەی گرتووە بەهۆی دنیایەک لە ئەزموون و لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەی چڕو پڕەوە چارەسەر دەکات . بێگومان دانانی پلان و ئیش لەسەر کردنی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەیەکتر جودایە، بە هۆی جیاوازی کێشەو کەم و کوڕیەکانەوە

چ لە هەرێمێک بێ یان لە دەوڵەتێکدا، هەروەها دۆزینەوەی چارەسەر و چاککردنیان بە هەمان شێوە لەیەکتر جودایە، لە هێنانەدی هاوسەنگی لە نێوان ئیش و نیشتەجێبووندا، وە لە نێوان خزمەتگوزاری و دانیشتواندا. پلاندانان کۆمەڵێک ئامانجی هەیە لەوانە :

١. کار کردن لەسەر چاککردنی ژینگەی شار، لە پێناو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئارامی و دۆزینەوەی چالاکی جۆراو جۆری ئابوری گونجاو بۆ دانیشتوانەکەی .

٢. کارکردن لە پێناو پرۆسەی تایبەت بۆ گەشەکردنی کۆمەڵگا، هەروەها لە پێناو وەدیهێنانی لایەنی تەرفیهی و ئارامی و ئاسایشی دانیشتوانی شار .

٣. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕەگەزە گرنگەکان لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی دانیشتوانی شار .

٤. کارکردن لەسەر دابەشکردنی چالاکیەکانی دانیشتوان، وەکو چالاکی ئابوری و چالاکی گشت کەرتە خزمەتگوزاریەکانی تر کە بگونجێ لەتەک داواکاری دانیشتوانی شاردا .

٥. کارکردن لە پێناو دابینکردنی سەرجەم خزمەتگوزاریەکان، کە لەتەک چڕی دانیشتوانی شاردا بگونجێ.

## زەروریەتی ماستەر پلانی شاری کەلار لە چیدایە ؟

بێگومان هەر کارێک کە مرۆڤ بیەوێ بە شێوازێکی ڕاست و دروست و بێ دەردە سەری بڕواتە ڕێوە و دووچاری تەنگەژەو گیروگرفت نەبێ، یان هەر نەبێ کەمتر ڕووبەڕوویان بێتەوە، ئەوا پێویستە بە وردی قۆڵی لێهەڵبکات و پلانێکی تۆکمەو وردی بۆ دابنێ، ئەوەیان لەسەر ئاستی تاکە.. بەڵام کاتێک دەست ببرێ بۆ ئیش و کاری گەورەو مەزنتر، بە دڵنیاییەوە پێویستی بە پلانێکی چڕو پڕو سیخناخ لە وردەکاری هەیە، هەروەها پێویستی بە خەڵکی خەمخۆر و شارەزاو دڵسۆز هەیە، بۆ ئەوەی کاروانی ئیش و کارەکان بە سەلامەتی بگاتە مەنزڵ، بۆ گەیشتن بە مەنزڵیش دنیایەک تێکۆشان و خۆبۆ تەرخان کردن و دەست هەڵگرتن لە ئیش و کاری تر و ماندوێتی زۆری پێویستە .

شاری کەلار وەکو تەمەن شارێکی تازەیە و ناگاتە نیو سەدە، بەڵام لە ڕووی گەشەکردن و فراوان بوونی ڕووبەروو ژمارەی دانیشتوانەوە زۆر ڕۆیشتووە و تەکانی باشی داوە بە بەراورد لەتەک شارەکانی تری وەک ئەودا، ئەمیان هەنگاو گەلێکی پێشکەوتووتری هاویشتووە، لەتەک ئەوەشدا ناکرێ هەروا بە خۆڕا و بێ پلانی ورد بەردەوام بێ لە گەشەکردن وفراوان بوون، بەڵکو پێویستە لەسەری ڕابوەستین و لە ئێستە بە دواوە هەرچی بەردێک بخرێتە سەر بەردێکی تر بێ پلان نەبێ، چونکە ئیش و کار و پرۆژەکان دەبن بە گۆترەو هیچ بەرچاو ڕوونیەکیشی نابێ، هەروەها ئەگەری زۆریشی لەسەرە بۆ داهاتوو ڕووبەڕووی کێشەی گەورەتر لە نەبوونی پلانەکە ببینەوە، لەبەر ئەوە شوێنی شاری کەلار کەوتۆتە جێگەیەکی ستراتیژی

گرنگ لە ڕووی « ئابووری و سیاسی و ئیداری » وە بەردەوام بە شێوەیەکی زیاتر لە گەشەی ستانداردی جیهانی لە فراوانبوون و گەشەکردندایە و تادێ خواست لەسەر زەوی و خانوو و شوێنی ئیش و کار و کەسابەت زیاتر دەبێ بە بەراورد لەتەک شوێنەکانی تردا. کەوایە دەبێ ئەوە بزانرێت کاتێک لە شاردا قەرەباڵغی و هاتووچۆ و نیشتەجێبوون دای لە زیادی، ئیدی ئەگەری فەوزا و زیادەڕۆیی و کردەوەی نایاسایی و زۆر بابەتی دیکە ئەگەری سەرهەڵدان و تەشەنەکردنیان لە گۆڕێدایە !

بەبێ ماستەر پلان، نە ئیدارەی شار و نە دانیشتوانەکەی هیچ بەرچاو ڕوونیەکیان بۆ داهاتوو لا نابێ، جگە لەوەی ڕەنگە دەیان پرۆژەی ڕێگاو بان و بینای دامودەزگای گشت سێکتەرە خزمەتگوزاریە جیاوازەکانی دەوڵەت و شتی دیکە، کە ئێستا دروستکراوەو لە داهاتووشدا بنیات دەنرێ، بەڵام بەبێ دراسەتی ورد و لێوردبوونەوە و خوێندنەوەی شارەزایانە، ئەگەری تووش بوون بە زیانی گەورەی ئابووری لێدەکەوێتەوە.

شاری کەلار، دەبێ لە لایەن خەڵکی ڕۆشنبیر و دڵسۆز و دەست ڕۆیشتوو کاربەدەستان و ڕێکخراوەکانی ئەم ناوچەیە « گەرمیان »، بکرێ بە شارێکی نموونەی و سەردەمی زۆر جوان، بە بێ تەشەنووجات و ململانێی ناشارستانی، دەبێ بکرێ بە ناوەندێکی گرنگتری گەرمیان و گەرمیانیەکان، بۆ بواری ڕۆشنبیری و ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و گەشت و گوزاری و ... تاد، بێگومان ئەوانەش بەشێکی دانەبڕاون لە سیستەمی ماستەر پلانی شاردا .

## سەبارەت بەو شتە زۆر گرنگانەی کە پێویستە لە ماستەر پلانی شاری کەلاردا جێی بۆ بکرێتەوە، گرنگترینیان :

١. فەرامۆش نەکردنی ڕووباری سیروان، چ بۆ سەوزکردنی دەوروپشتی شار « پشتێنەی سەوزای شار »، چونکە هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی شاری کەلار کەوتۆتە ناوچەیەکی گەرم و تاقەت پروکێن، کە پلەی گەرمای ساڵانە لە وەرزی دوورو درێژی هاویندا دەگاتە سەرووی « ٤٥ » پلەی سیلیزی، بۆیە لە گشت ناوچەیەکی تری هەرێمی کوردستان زیاتر پێویستی بە ڕووپۆشی سەوزای هەیە. هەروەها بە کارهێنانی ئاوی ڕووباری سیروان بۆ خواردنەوەی دانیشتوانەکەی دوای پاڵاوتنی بە شێوەیەکی زانستی، لەتەک ئەوەشدا ناکرێ بایەخ بە کەرتی گەشت و گوزاری لە دەورووبەری ئەو ڕووبارەدا نەدرێ و لە ماستەر پلاندا دەبێ بە وردی کاری لەسەر بکرێ .

٢. ئەگەر لە ڕووی یاساییەوە کێشەی نەبێ، یان بتوانرێت ڕێگە چارەی بۆ بدۆزرێتەوە، وا باشە بۆ داهاتوو ئیش لەسەر ئەوە بکرێ، کە ڕووباری سیروان بکەوێتە سەنتەری شارەوە، واتە بەشێک لەو گەرەک و دام و دەزگا و پرۆژەی جۆراو جۆر و خانووانەی

له داهاتوودا دروست ئەکرێ، بکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕووبارەکەوە، ئەوەش بە پردی پێشکەوتوو هەردوو بەری شار پێکەوە ببەسترێت، بێگومان دەبێتە شارێکی نموونەیی .

٣. زیاد کردنی ڕووبەری سەوزای لەسەنتەری شاردا، بە جۆرێ لە ژمارەی ستانداردی جیهانی هیچ نەبێ کەمتر نەبێ کە « ١٥ ٪ » ە .

٤. فراوان بوونی ستوونی شاری کەلار، لە بری ئاسۆیی، ئەوەش لەبەر دوو هۆکاری گرنگ :

أ. بەرزکردنەوەی شار « شووقە »، ڕووبەری کەمتری پێویستەو خەڵکی زۆرتری تێدا نیشتەجێ دەبێ .

ب. گشت خزمەتگوزاریەکانی « ئاو و کارەبا و ئاوەڕۆ و ڕیسایکل و پارک و ڕێگاو بان و .. تاد » کەمتری پێویستە وەک ئاسۆیی .

٥. بۆ داهاتوو پێویستە بایەخی زیاتر بە تۆڕی ڕێگاو بان بە گشت جۆرەکانیەوە بدرێت .

٦. شاری کەلار چ شارێکە ؟ دەبێ ناوی لێبنرێت، شاری ئابوری یان ئیداری یان گەشتیاری یان چی ؟



# له ئەسپەناغەوە بۆ شار

زاگرۆس ئەحمەد

سالّی ١٩٦٣، ئەمیری قازی و کاک فایەق، لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دێنە کەلار. هەردوکیان دەچنە چاخانەیەک لە کەلار، وەک ئەمیری قازی لە یادەوەرییەکانی خۆیا باسیئەکات (لە بیرەوەرییە سیاسییەکانم)، چاخانەکە کەپرێکی دوور و درێژ بوو، دەوروبەری کەپرەکە لەهەر چوارلاوە بە دڕوی وشترخۆرە هەڵچنرابوو. لولەی ئاویان بۆ دانابوو، دڵۆپ دڵۆپ دەکەوتە سەر وشترخۆری کەپرەکە و هەوایەکی فێنکی لەو سەحرا و گەرمایەدا دەدا و، لوتف و هەستێکی تایبەتی بە گەشتیار دەبەخشی.

وەک ئەمیری قازی باسیدەکات، هەرچۆنێک بێت چایچی هاتە بەردەممان و پرسی: چی دەخۆن؟ گوتم: چی هەیە بۆ خواردن؟ گوتی: ئەسپەناغ. زۆر دڵمان خۆش بوو،

دوای ماوەیەکی زۆر ئەسپەناغ دەبینین و دەیخۆین. کابرا ڕۆیی و پاش تۆزێک بە سینییەک و دەفرێکی پڕ لە ئاوی شین گەڕایەوە و لە پێشی داناین.

– کاکە ئەو شیناوە چیە؟

– ئەوە سڵقە.

– ئاخر نەتگوت ئەسپەناغ هەیە؟

– جا فەرقی چیە!

ئەو کورتە نوسینەی سەرەوە، تاکە ڕوانینێکی مێژوویيە بۆ دۆخی کەلار و شێوازی مامەڵە لەگەڵ هاموشۆکەرانی ئەم شارە، بەتایبەت لەساڵانی شەستی سەدەی ڕابردوو. گەرنا تەواوی تێکستەکانی نێو ئەم نوسینە، لە دیدگایەکی تیۆرییەوە نوسراون و هەوڵدانێکن بۆ ڕوانین لە زیاد لە ڕووبەرێکی کۆمەڵایەتی و دۆزینەوەی بەها و بکەرەکانی ناو ئەو ڕووبەرانە و ئاشکراکردنی شێوازەکانی بیرکردنەوە و جموجۆڵ و کردە و، پراکتیکی کۆمەڵایەتی ڕابردوو و ئێستای کەلار. هەموو ئەمانەش وەک ڕێگایەک بۆ وێناکردنی دونیای کۆمەڵایەتی ئەم شارە وەک دونیایەکی ئاڵۆز، کە هەم هێزی جیاوازی تێدایە و هەم هەمووشیان لە جوڵە و کردەی مێژوویی تایبەتی خۆیاندان.

ئەو بیرەوەرییەی سەرەوە کە باسکرا، ئەوەمان پیشان دەدات کە، کەلار لەو قۆناغە مێژووییەدا زیاتر ناشوێنە وەک لەوەی شوێن بێت، داخۆ نەبوونی میوانخانەیەک و دەزگایەکی سادە و ساکار بۆ میواندۆستی، هاوکات غیابی هوشیارییەک بۆ خستنەڕووی تیکە نانێک، ئەوە پیشان دەدات، لەو سات و دەمەدا، کەلار شوینیک بوبیت، بۆ جیگەخستنی بونیاد و خواست و پەیوەندییە کۆمەڵایەتي و ئابوورییەکان، بیگومان نەخێر، بەلکو زیاتر جێگەیەکی ڕاگوزەربووە و تاکە سەرچاوەی بوونی، بریتیبووە لە ڕاڕەوێک بۆ ڕێبواران کە سەردانی شارانی تر دەکەن.

دەرەکەوەی ئەم جێگەیە، زیاتر چۆڵایی بووە، وەک لەوەی پنتێک بێت بۆ حەشامات و ژیانکردن. هەرچەندە چۆڵایی بۆ دەروونی مرۆڤ جۆرێک لە سام و ترس لەگەڵ خۆیدا دێنیتە ئارا، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەوپەڕی بوار بە بوونی خود ئەدا، هەرچەندە بوونی دونیایەکی پڕ و ژیانکردنی جەنجاڵ، کاریگەرییەکی زیاتری هەیە بۆ بونیاتنانی گفتوگۆ. لێرەدا ڕێی تێئەچێت بڵێین تاکی ئەم دەشت و دەرەی کەلار، زیاتر خاوەن خوودی کەلاریبوون و کەلار ڕەفتارن، شێوە بیرکردنەوەیان جۆرێکی تایبەتە و ڕەنگدانەوەی هیچ شوێنێکی تری بەسەرەوە نیە. چواردەوری ئەم جێگەیە، گیراوە بە شارە کۆنەکان(دیالە، خانقین، کفری، گوڵاڵە، سلێمانی)، کەچی وەک ئەوەی کەلار لە دەرەوەی سیستەم بێت، هیچ ڕەنگدانەوەیەکی ئەم شارانە

لە ڕابردوودا بەسەرەوە نەبووە. ئەو ڕابرووە پاشخانێکی بەهێز و کاریگەربووە بۆ نەوەکانی ئێستای ناوچەکە، چونکە ئێستا بە زەقی هەست بەوە ئەکرێت، کە کەلاریبوون خاوەن بوونێکی ئازادە، باشتر دەتوانێت نوێنەرایەتی خۆی بکات، دەتوانێت بڕیار بدات، دەتوانێت خۆی دەربڕێت، دەتوانێت جێگەی متمانە بێت. هاوزەمان لەگەڵ ئەوەشدا، سروشتی چۆڵەوانیەکەی وایکردووە، زمان و شێوەی گفتوگۆی ناوچەکە، شێوەیەکی ڕەق و کورت مەودا بێت، تاقەت و حەوسەڵەی جڤین و دانیشتنی مەجلیس و دیوەخانە گەورەکانی نەبێت، ڕاستە هۆزەکانی جاف لەم ناوچەیە کاریگەر و دەمسپی بوون، بەڵام ئەمە لە سروشتی سوسیۆلۆژیانەی خەڵکەکەی ڕەنگینەداوەتەوە.

هەر ئەو پرۆسەیەی سەرەوە، وایکردووە گەرمیان وەک پێکهاتەیەک لەگەڵ ئاشنابوون و نیشتەجێبوون و گوزەرانکردندا، هەرگیز خۆی بە ئاسانی بەدەستەوە نادات، سروشتێکە ملنەدان لە ناخیایەتی. ئەوە نیە بە تەواوی یاخی بێت، بەڵام هەرگیز ناشبێتە دۆست، زوو هەڵدەچێت و تورە دەبێت، خێرا دەتورێت، بە زووی دڵی دەشکێت، لەنێوان ڕەقی و ناسکیدا تێکەڵەیەکی سەیری هەیە، هەڵچونی خێرای هەیە، هەڵچونی توندی هەیە، کەچی هەمیشە ڕەگێکی قوڵی لە ناسکی و هەستی شاعیرانەی تێدایە.

## کەلار وەك چوارچێوە.

کەلار جێگەیەکە لەسەر زەمینێک، کە گەرما لە هەرە دیارترین دیاردەکانیەتی. گەرمیان بە گشتی و کەلار بە تایبەتی وڵاتی خۆرە، ژینگە و کەش و هەوا کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر ژیار و کەسایەتی کەسەکان، لەسەر دەرکەوتە و ڕواڵەتیان. ئەگەر ڕۆژێک کوردستان ببێتە وڵات، کەلار دەکەوێتە نزیک سنورەکانی باشور لەگەڵ عەرەبدا. وەکچۆن ئێستاش لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا، کەلار دوا سنورەکانیەتی لەگەڵ عەرەب. لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە سەرباری ئەوی کەلار کۆتا خاڵەکانی هەرێمە لە باشورەوە، کەچی پەراوێز نیە و زیاتر ڕۆڵی ناوەند دەگێڕێت، چونکە بووە بە جێگایەک ڕۆڵی دراوسێ دەبینێت لەگەڵ وڵاتێکی وەکو ئێران، هەروەها شوێنی گۆڕینەوە و بەریەککەوتنە لەگەڵ دوو نەتەوەی جودا(عەرەب،فارس). لێرەدا خەڵکی ئەم شارە ڕووبەڕووی کەلتوری دیکەش بوونەتەوە، بەهایەکی تر و ژیارێکی تری جودای لەوەی خۆی بینیوەتەوە. ئەم سنورەی کەلار، تەنانەت لەگەڵ عەرەب و فارس نیە وەکو نەتەوەی سەردەست، بەڵکو لە هەمانکاتدا لەگەڵ کۆمەڵێک ژێر کەلتوری تریشدایە، وەک

کەلتوری شیعە، کاکەیی، تورکمان و عەرەبی سوننی.

یەکێک لە دەرکەوتە سەرەکییەکانی ژیانی شار، بەتایبەتی شارەکانی ناو دونیای مۆدێرن، شارە گەورە و قەرەباڵغەکانی دونیا، بریتییە لە ئامادەگی دیاردەی فرەدینی و فرەدینداری و فرە شوناسی و نەژادی. هیچ شارێکی ئەم سەردەمە نیە چەندان دینی جیاواز و چەندان گرووپی دینی هەمەجۆر چەندان گرووپی کەمدین و بێ دینیی تێدا نەبێت. جا بۆیە ئەم تێکەڵییەی کەلار ، ئاشنابوون و ناسینی چواردەور، نەبووەتە هۆی ڕەتکردنەوە و قەبوڵنەکردن و ڕەتکردنەوەی ئەو کەلتورانەی دیکە کە باسمانکردن، بە پێچەوانەوە ئەم جوگرافیا تایبەتە بووە بە ماڵێک بۆ ژیانی هەمووان. هەموو کەمینە و مەزهەبێک بە شێوازی جیاواز لەیەکتر نمایشی شێوە ژیان و ئادابی کەلتوری خۆیان دەکەن.

ڕووبار، لە دونیای مۆدێرندا، لەڕێگای تەکنەلوژیاوە، وای لێکراوە بکرێت بە ڕێگایەک کە هەموو کەس بتوانن پیایدا تێپەڕبن، ڕووبار لە سروشتە سەرشێت و هەڵکشاوەکەی خۆی دەخرێت و لە پەلوپۆ دەخرێت. دەکرێتە جێگەیەک هەموو کەس بتوانێت سەردانی بکات و وەکو پنتێکی گەشتیاری سەرنجڕاکێش لێی بڕوانرێت. بۆئەوەی هەستی شاعیرانەت پێ ببەخشێت و بۆ دونیای ئەندێشەیی بتڕفێنێ. ڕووباری سیروان، لە ڕابردوودا ڕووباری سەرشێتی و سروشتی ئاوهەوای جوان بووە، سەرچاوەی ئیلهام و ئەندێشەی هەستی شاعیران بوو. بەڵام لەچوارچێوەی دونیای مۆدێرن و ڕۆڵی تەکنەلۆژیا، پێچەوانەی دونیابینی مۆدێرن، سیروان لە ئێستادا دەبێتە شوێنی پیسی و پۆخڵی شار. وەک تاکە کەرەستەی ژێرخانی کەرەستەی سروشتی لێی دەڕوانرێت، خاڵی ئەکرێتەوە لە سروشتی ڕاستەقینەی خۆی وەک ڕووبار. ئەکرێتە بەشێکی خۆشەکراوی شار، کە شیوەنی مەرگی خۆی دەنوسێتەوە.

کەلاڕ لە ئێستادا، شوێنی کۆبوونەوە گەورەکانی ناوچەکەیە، شوێنی کۆکردنەوەی خەڵکە لە دەوری چەندین بیرۆکەی ئاینی، کە زۆرجار هەزاران کەس لە دەوری بانگخوازێک و مزگەوتێک کۆ کۆئەکاتەوە. شوێنی کۆکردنەوەی دەیان هەزار کەسە لە چوارچێوەی چەندین ڕێکخراو و پارتی سیاسی و نا سیاسی. ئەم شارە لە ئێستا ڕووبەرێکی گەورە و فراوانە کە توانای کۆکردنەوەی ژمارەیەکی گەورەی لە خەڵک هەیە. ناوەندێکە لە چوارچێوەیەکی پەراوێزا.

## کەلار وەك یادەوەری.

هەرچەندە ڕابردووی کەلار شایانی ستایش و پیاهەڵگوتن و نەمرکردنیش بێت، هێشتا ناچارین بۆئەوەی لێی تێبگەین، پەیوەندی بەو ڕابردووەوە بکەین. واتە دەبێت، ئەو ڕابردووە وەک پیرۆزییەک بخەینە لاوە و وەک بابەتێک ڕووبەڕووی ببینەوە، کە دەشێت ڕەتی بکەینەوە یان گومان لە پیرۆزییەکانیشی بکەین. ناکرێت و نابێت ئێمە تا سەر لەگەڵ ڕابردوودا میهرەبان بین، چونکە ئەم کارە دەمانخاتە دژایەتییەکی کوشندەوە لەگەڵ ئێستایشدا. بێگومان ناشیرینییەکانی ئێستا، سەرنجمان بەلای جوانییەکانی ڕابردوو ڕادەکێشێتەوە. کەواتە هەڵەیەکی گەورە دەکەین گەر ئەو ڕابردووە تەنها لە بۆتەی جوانی و تەباییەکاندا ببینین، چونکە ڕابردووش پانتاییەکە پڕە لە ناشرینی و دزێوی خۆی، لە چەوساندنەوە و نایەکسانی. هاوکات دەبێت ئەو پرسیارەش بکەین بۆچی تەنها جوانییەکانی ڕابردووی ئەم شارە بە ئێمە گەیشتوون؟ ئالێرەدایە ڕابردوو دەبێتە سەرمەشق و فێرمان دەکات، لە ڕێگەی جوانکردنی ساتی هەنوکەیی خۆمانەوە، لەڕێگەی ڕێگەگرتن لە دەستدرێژییەکان، نارەوایەتی و چەوساندنەوەکانەوە، (جوانی) لەم ئێستایەماندا ئامادە بکەین، بۆئەوەی ئێستای ئێمەش لە داهاتوودا شایانی یادکردنەوە بێت. بەڵام بۆ ئەمکارە سیستەمی ستایش و دارشتنەوەی وەسفی یارمەتیمان نادات و کار بەوە تەواو نابێت بکەوینە یادکردنەوەی ڕابڕدوو بە نیازی نەمرکردنی. بەڵکو گرنگترین خاڵ، ڕەنگە تێرامانێکی ڕەخنەیی بێت بۆئەوەی بتوانین لەو ڕابردووە تێبگەین.

یادی بە قەزابوونی کەلار پیرۆزبێت، بەو نیازەی ئەمجۆرە لە یادکردنەوە، فێرمان بکات و ئاشنامان بکات بە ڕابردوو، بۆئەوەی جوانتر داهاتوو بنوسینەوە.



# کەشکۆڵی شاکەلی و بیرەوەریەک

سالّەح هەلاج



ساڵی ١٩٨٤ شەوێک بۆ سەردانیکردنی چوومە خزمەتی کۆچکردوو ( شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی لە گوندی سەیدە.

ئەو سەردەمە کاکە شێخ زۆر بێ تاقەت بوو چونکە کوڕەکانی فەرهاد شاکەلی و ئەمجەد شاکەلی و سەلاح شاکەلی بە هۆی کێشەی سیاسییەوە لێی دوور کەوتبوونەوە و پەرتەوازەی وڵاتان بووبوون، بە چوونی من زۆر خۆشحاڵ بوو، لە بیرمە وتی: هەلاج گیان زۆر چاکت کرد هاتی کاتی خۆی بوو. من لە مەبەستەکەی گەیشتم .

شەوێ لە ژێر دارگەزەکانی حەوشەکەیان دانیشتبووین دوو بە دوو.

شەوێک بوو پڕ لە دەمەتەقێی شیعر و پەند و کوردایەتی و قسەی خۆش، درەنگانێ چوو لە کتێبخانەکەی دوو کتێبی هێنا دانەیەکیان گۆڤارێک بوو بە ناوی ( مامۆستای کورد) فەرهاد شاکەلی لە سوید دەریدەکرد، بە بینینی ئەو گۆڤارە زۆر خۆشحاڵ بووم،

چونکە تا ئەو ساتە نەمدەزانی لە تاراوگە کتێب و گۆڤاری کوردی دەردەچێ.
دووەم کەشکۆڵێک بوو بە ناوی (کەشکۆڵی شاکەلی ) ئەویش هەر زۆر گرنگ بوو بەلامەوە.
چونکە من خەریکی کۆکردنەوەی شیعر و شاعیرانی گەرمیان و شیعرەکانی (فەقێ سمایلی زەنگەنە) بووم، ئەو شتەی من دەمەویست لەو کەشکۆڵەدا گەلێک شاعیری گەرمیان هەبوو کە من ناویانم نەدەزانی.
کەشکۆڵی شاکەلی پاش مەرگی کۆچکردوو (شێخ مەحمودی شێخ سلێمانی شاکەلی) یە.
شێخ مەحمود کوڕی شێخ سلێمان کوڕی شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعیدە رووتەی شاکەل.
شێخ مەحمود خاوەنی کەشکۆڵی شاکەلی ساڵی ١٩١٩ لە دایک بووە و ساڵی ١٩٤٥ کۆچی دوای کردووە واتە ئەم زاتە تەنها ٢٥ ساڵ ژیاوە.
شێخ مەحمود گەرچی تەمەنێکی کەمی کردووە، بەلام عاشقی شیعر و ئەدەب بووە، لەو ماوە کورتەدا کەشکۆڵێکی زۆر بە پێزی بۆ جێ هێشتووین کە بە سەدان شیعری شاعیرانی کورد و فارس و رووداوەکانی تێدا نووسیوەتەوە.
بە دەستخەتێکی جوان و سەلیقەیەکی هونەری شیعرەکانی تێدا تۆمارکردووە.
ئەو شاعیرانەی من سوودم لێبینی :
مەولانا خالدی نەقشبەندی و فەقێ سمایلی زەنگەنە و ڕەزا بەگی جاف(دانش) و مینە جاف و شێخ ئەحمەدی شاکەلی وشێخ عەلی شاکەلی(غالب) ئێنجە ئاغای گلاڵی و گەلێ گەلێ تر.
کورد وتەنی (نرخی زێڕ لای زەرەنگەرە) ئەم بنەماڵە چونکە عاشقی کتێب و شیعر و ئەدەبن لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابووردوو وە وە، بە هۆی ڕووداوەکانی کوردستانەوە کە خۆیان کارەکتەری دیار بوون لە خەبات و تێکۆشاندا، چەندین جار تووشی گرتن و ڕاوەدوونان و ئاوارەیی بوونەتەوە، بەلام ئەم کەشکۆڵە وەکو مۆزەیەکی گرنگ بە سەر سنگەوە لەم دێ بۆ ئەو دێ و لەم شارەوە بۆ ئەو شار و لەم وڵاتەوە بۆ ئەو وڵات لە گەڵ خۆیاندا هەڵیانگرتووە.
تەنانەت لە کۆڕەوەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ لە گەڵ خۆیان بردویانە بۆ ئێران، بە هۆی ئەو هەموو ناخۆشیانەوە کەشکۆڵەکە نەختێ پەرپووت بووبوو. بەلام لە دیوی ئێران دۆستێکی خۆیان بە ناوی ( بارام

وەڵەد بەگی) لە ئێران فۆتۆکۆپی کردووە، ئەم کەشکۆڵە جگە لە شیعر، گەلێک بابەتی ڕۆژانە و جیهانی بە سوودی تێدا تۆمار کراوە وەکو نموونەیەک دەڵێت:

«ئەمڕۆ ١٣/ ٣/ ١٩٤٤بێبارانی تەواو کەلاری هیلاک کردووە ئەگەر بشواریَ تا پێنج ڕۆژی تر ئەمەل هەیە خەلەیَ شناوە* دەست بکەویَ ، مادام لە سەر یەک بواریَ تا (تار) وەڵڵا هیچ ناویَ خوا ڕەحم بەم عالەمە بکات»

پاشان دەڵێت:

لە ١٤/ ٣/ تاویَ باران باش باری»

پاشتر نووسیوویەتی

لە ٣/١٥ باران باش باری هەموو عالەمی دەڵخۆشکرد»

لێرەدا وشەی ( شناوە)ی بەکار هێناوە ، شناوە واتە پارچەیەک زەوی بچکۆلە بۆ چاندن. واتە (شکارتە).

نموونەیەکی دیکە لەم کەشکۆڵەدا هاتووە و دەڵێت:

«شەوی جمعە ١٩ ی کانوونی دووەم ٤ی سەفەر (مەلا ئەحمەد میرەدیَ) عەمری خوای کرد.

پاشان هاتووە:

لە تلوعی فەجردا (دەروێش حەمە موراد) عەمری خوای کرد. تەصادفیان یەک ڕۆژە و لە قەورسانی حاجی شێخ عەلی دەفنکران».

لەم کەشکۆڵەدا نزیکەی ( ٢٣٠) دوو سەد و سی پارچە شیعری ٦٠ شەست شاعیری کورد و فارسی تێدا نووسراوەتەوە.

وەکو لە پێشدا ئاماژەمان پێداوە ئەم کەشکۆڵە جگە لە کۆکردنەوەی شیعری شاعیران، گرنگی بە زۆر ڕووداوی خۆش و ناخۆشی ناوچەی کەلاری داوە .

لە کۆتایەکەدا هەندیَ نووسەر وەکو برایم باجەلاَن و مستەفا نەریمان بە چەند دێرێک باسی گرنگی ئەم کەشکۆڵەیان کردووە.



# ڕۆڵی زانستی سروشت له ناسنامەی شار

(شاری کەلار بۆ نمونە)

پ.ی.د.خالد فائق پاڵانی
مامۆستای زانکۆ گەرمیان
چالاکوانی ژینگەو سروشت
ڕاگری پەیمانگای تەکنیکی تایبەت لەکەلار

دیارە کە ناسنامەی گەلان و وڵاتان پێکدێت لە مێژووی ڕابردووی لەداستان وهونەری شارستانیەتی بونیاندراو و نوسراو و تەکنەلۆجیای ئیستای بەسەرجەم بوارەکانی سەردەمی هاوچەرخ, بەڵام بونی زیندەوەران بەهەموو جورەکانی ڕووەک وباڵندە وکەرو وقەوزە وشیردەرەرەکان ئەوەی لێکردووە کە وەڵاتیکی زلهێز وەکو ئەمریکا شانازی بەباڵندەیەکی خۆیەوە بکات بەناوی Bald Eagle کە وەکو هێمایەک لە ئارمی نیشتیمانی National symbol ئەو وەڵاتە دانراوە یان بونی باڵندەی بەبەغا لە هیمای نیشتمانی دورگەی سانت لوسیا ...هتد, مێژوی عیراقی کۆن ئاماژە ئەکات بە بونی شێری عیراق کە پەیکەرەکەی لە شاری بابلە, هەروەها زۆربەی وەڵاتان لە لۆگوی تایبەتی خۆی ولە هێمای هیزی سەربازی وپۆلیسیدا یاخود لە دراوی چاپکراوی ئەو وەڵاتە ئاماژەیەک ئەبینری بۆ جۆرە زیندەوەرێک بەمەستی نیشاندانی بەهێزی یان میهرەبانی ئەو حوکمرانییە.

شاری کەلار لە سەرەتای دروستبونیەوە لەسەر ڕوباری سیروان وەک شادەماری نیوان دوو دەریاچەی گرنگی ناوچەکە ولەسەر خاکیکی پڕپیت ولەوەریکی دەوڵەمەند, وایکرد کە چەندین زیندەوەر لەخۆی بگرێت ئەگەر چی ناوی کەلار لەهەندێ سەرچاوە ئاماژەی بۆ بونی کەڵە ئاسکە کە بەهۆی فروانبونی شارەوە لەئیستادا تەنها لە دەوروبەری ماوەتەوە.جیگای باسە کە ڕوباری سیروان بەدرێژی دەیان کیلومەتر لە دەریاچەی دەربەندیخانەوە تا گوندەکانی خواری

کەلار چەندین دیمەنی سەرنجراکێش ودڵگیری هەیە بەبونی چەند جۆری داری بەتەمەن بوتە ماڵو هێلانەی جورەهای باڵندەی نشتەجی وکۆچکەر کە بونیان ئاماژەی بۆ دەوڵەمەندی ناوچەکەیە کەساڵانیش بەهوی وەرینی گەڵای دارە وشێداری ناوچەکە خاکیکی تێر بەمادە ئەندامی لە خۆی ئەگرێت کەئەمەیش چینیکی کونجاوە بۆ دروستبوونی چەندین جۆری قارچک وهاوشێوەکانی کە زۆربەیان خاوەن بەهای خوراکی وپزیشکین نەناسراوە لەلایەن خەلکی ناوچکە پێویستی بە لیکۆلینەوە وتوژینەوەی زانستییە بۆ ناساندنی وپاراستنی وەکو میراتیکی نیشتیمانی ,هەر وەها بوونی چەند جۆریکی رووەک کە بەناوهێنانی ئەمانگەرینیتەوە بۆ چیرۆکی ئەفسانەیی گوڵی ئۆرکید کە جۆری Ophrys mammosa لەو سرۆشتە بونی هەیە کە لەئیستادا لە لیستی سورە بۆ لەناوچوونی زیندەوەران IUCN Red List.

هەمەجۆری سروشت هەمەچەشنی زیندەیی بەخویدا هێناوە, هەر چەند فروانبوونی شار لەسەر لەناوچوونی سرۆشت دروست ئەبێت بەلاَم هۆشیاری خەلک ودروستبونی دەزگای ئەکادیمی وبەرهەمێنانی نەوەیکی خوینەر وچاودێر وایلیکردووە بەها سروشتیەکانی شار ئاشکرا بێت کە چەندین جۆری باڵندەی گرنگ ولەژێر مەترسی لەناوچووندایە لە سنوری شار بینراوە (سۆنەی Marbled teal , باڵاڵندەی Iraq babler وپاساری دەریا مردوو Dead sea sparrow لەگەلچ جۆرەکانی دیکەی پاساری و مەلیجوک) و رووەک وقارچکی دەگمەن تۆمار کراوە کە دووائیان ئەو کێڵگە سروشتییەی قارچکی مۆرڵ Morchella esculanta لەجوری کیسی لەنزیکی ناوچەی پیشەسازی شاری کەلار بینرا وبوە هەواڵ و سەرەنجی دەزگا میدیاییەکان ومەڵپەرە ئەلیکترۆنییەکانی کوردستان وداواکاری توێژەرانە لە دەرەوەی کوردستان بەمەبەستی زیادکردنی وبەرهەمهێنانی,جیگای باسە دۆزینەوەی ئەم قارچکە بەو ژمارە زۆرەو و بەقەبارەی گەورە ئومێدێک ئەبەخشێت بەرەو دۆزینەوە هوکاری تایبەتمەندبوونی ئەم شوێنە ولەئەگەر دەستنیشانکردنی هۆکارەکان ئەو دەمانبات بەرەو بیرکردنەوە لە پرۆژەیەکی نیشتمانی هاوشێوە دروستکردنی دۆمەڵان وقارجکی سپی کە نرخی قارچکی مۆرل دە ئەوەندی نرخی دۆمەلانە وگرنگی پزیشکی وخوراکی لە جیهاندا روونوئاشکرایە تا رادەیەک کە لە مەڵپەرە بازرگانیەکان نرخی جێگیرە.

دورکەوتن لە سەنتەری شاری کەلار بەرو ناحییەو لادیەکەن بێ بەشت ناکات لە جوانی سروشت ,دەنگی باڵندەی پڕ لە ناو کیلگەکانی ناوچە کشتوکالیەکانی وخشەکردنی بزنمژەگ لەناوچە وشکاییەکانی باشوری کەلار لەهاویندا هەموان ئاشناکردە بە بەهەمەجۆری زیندەیی ,وگەرانی ورد بەدوای قەوزەو کەڕو چەندین نهێنی ئاشکرا ئەکات ووردەکاری زیاتر ئەدات بەکارهێنانی ئامێری مایکرۆسکۆپ لە تاقیگە زانستییەکانی زانکۆی

گەرمیان ,چەندین ڕووەکی پزیشکی ئاسەواری ماوەتەوە لە ناوشار ودەوروبەری کەلەڕابردوو سەرچاوە بو بۆ دەرمانسازی (شەفەلح یان مارگیر Caper وگوڵی زورنا Datura یان عەرەب قۆزی Moghatکە لەڕابردوو بە وتەی بەتەمەنەکانی ناوچەکە خەڵکی وەڵاتی میسر ساڵانە هاتوون بۆ کۆکردنی ئەم گیاییە بەسودە بۆ چارەسەرکردنی نەزۆکی وتا ئێستا لەو وەڵاتە بەشێوەی چاندن زیاد ئەکرێت وسودی لێ وەرئەگرێت وبازرگانییشی پێوەئەکرێت لەکاتیکدا بەرەو لەناوچون دەڕوات.لەناوچوونی ئەم گیایە سروشتییە بە چەند هوکاری بچوک وگەورەیە ,زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان ودورکەوتن لە سروشت وەکو دەرمانخانەیەکی سەرەکی هاوکات کەمی هۆشیاری ولیکۆلینەوە لەلایەکەوە وبەردەوامی مرۆڤ وەک کاریگەری سەرەکی لە تەماحی تاک بەرپرسیاریەتی برامبەر نەوی داهاتوو کە گەورەترین نمونەی بونی غەسالەکانی چەوو ولم لەسەر ڕوباری سیروان کە ئەو دیمەنە جوانەی سیروان کە بیسترا لە شیعرەکانی ئەحمەد شاکەلی بونی نەماوە جگە لە دوو سێ پارچەی نزیک قولە سوتاو وگۆڕەشەلەو قولەبەرز کە پێویستی بە هەوڵی جدی هەیە بۆ ڕێگریکردن لە لەناوچوونی وپێویستە بناسرێت وەکو ناوچەیەکی پاریزراو ئەگینا هەموو سیروان بەناوچە ویرانکراو(مەنکوب) دیاریبکرێت.

هەبوونی دەیان جۆری زیندەوەر لەڕابردوودا ومانەوەی پاشماوەی لەئیستادا سەرەنجی هەمووانی ڕاکێشاوە وبوەتە سەلمێنەری ڕەسەنی زمانی وکەلتوری ناوچەکە ولەدواینی پێشهاتە ئەکادیمیەکان دەرکردنی گۆڤاریکی زانستی ڕەسەن لە لایەن زانکۆی گەرمیانەوە بەناوی پاسەر(Passer) کە ئەمەیش ناوی زانستی پاسارییە لەهەموو جیهاندا وخیزانەکەیشی بە (Passariform) ناسراوە , ئاشکرایە ئەم ناوەیە ڕەسەنی ناوچەکە تێدایە کە بەهۆی دروستکردنی هێلانەکانی لە پاساری ماڵانی لادیەکانی گەرمیان بە پاساری ناسراوە.











سۆنەی Marbled teal جۆریکی لەژێر مەترسی لەناوچووندایە لە سەر ڕۆباری
سیروان نزیکی شاری کەلار بینراوە



قارچکی مۆرڵ Morchella esculanta لەجوری
کیسی لەنزیکی ناوچەی پیشەسازی شاری کەلار بینرا



ڕوەکی عەرەب قۆزی لەناو کێڵگەیەکی شاری کەلار
( ڕوەکی دەرمانسازی کۆنی بەناوبانگی ناوچەکە )



ڕوەکی ئۆرکید جۆری Orphys mammosa
( ڕوەکی لەناوچووە لە جیهان و لەرۆباری سیروان بونی هەیە )



پاساری دەریای مردوو سالانە سەردانی شاری کەلار دەکات



کەڕوی پزیزا Peziza لە ژێر مایکروسکۆپ



# کەلار لەژێر سێبەری دوکەڵدا

مشير عارف عەلی

نەوت یەکێکە لەجۆرەکانی سوتەمەنی کەزۆرترین بەکارهێنانی هەیە.لەگەڵ گازی سروشتیدا دوگرنگترین سەرچاوەی وزەن لەجیهاندا.نەوت لەناخی زەوی دەردەهێنرێت ودەگوێزرێتەوە بۆ پاڵاوگەکان بەمەبەستی جیاکردنەوەی وگۆرینی بۆ جۆرەها سوتەمەنی.

ئێمەش لەهەرێمی کوردستان،لەخۆشبەختیمان بێت یاخود بێ بەختی، بەخوایشتی خۆمان بێت یاخودنە،ناوچەی گەرمیانیش لەوناوچانەی هەرێمە کە دەوڵەمەندە بەسامانی سروشتی وەک(نەوت – گازو هتد).

پێشترو لەساڵیادەکانی رابوردودا،ئاماژە بۆ زۆرلایەنی(مێژویی،جوگرافی،ئابوری و هتد)کەلارکراوە،بەڵام بەوردی یاخودبەتایبەتی دەست نەبراوە یان هەڵوێستە نەکراوە بۆ گرفتێک و بەڵایەک کەلەم ساڵانەی دواییدا روبەروی کەلارو دەوروبەری بوەتەوە. ئەویش (پیسبونی ژینگەوئاسمانی شارەکەیە بەدوکەڵا وپاشماوەی سوتانی گازی بیرەنەوتەکانی دەوروبەری)...

بۆیە ئەگەرئێمەی دانیشتوانی ئەم شارە لەرابوردودا،گرفتی پیس بونی هەمەلایەنەی ژینگەو گرفتی نارونی گرێبەستەکانی نەوت ونادیاری داهاتەکەیمان هەبوبێت،ئەوا لەئێستادا گرفت وکێشەیەکی گەورەتریشی هاتوەتەسەر،ئەویش (پیس بونی ژینگەی کەلارودەوروبەریتی)بە دوکەڵ و دەرهاویشتەگازیەکانی ئەوبیرە نەوتیانەی کە کاری بەرهەم هێنانیان تێدا ئەنجام دەدرێت.کە بێگومان چەندین بیرە نەوت لە ناوچەکانی کەلارو نزیک لەکەش و هەوای شارەکە لێدراون و لەهەندێکیشیاندا کاری دەرهێنان و هەناردەکردنیش ئەنجام دەدرێت.پاشانیش بەرهەم هێنانی نەوت وپرۆسەی گواستنەوەوبەکارهێنانی لەدونیادا بێ پاشماوەو کاریگەری نەرێنی نابێت.بۆیە لەدوو رێگەوە دەبێتە هۆی پیس بونی ژینگە:

یەکەم/لەکاتی دەرهێنانیداو بەهۆی رژان وپاککردنەوەی پاشماوەکان وخۆرزگارکردن لێیان وهتد دروست دەبێت.

دوەم/ لەکاتی گواستنەوەیدا کەبەرێگای وشکانی وئاوی ئەنجام دەدرێت.بۆیە شکانی بۆری ورروداوی کەشتیەکانی نەوت،دەبێتە هۆی پیس بونی ژینگەی ئەوناوچەیە.بۆ نمونە:لەکاتی شەری داگیرکردنی کویتدا لەلایەن عێراقەوە لەساڵی ١٩٩١ دا،بەهۆی سوتاندنی بیرەنەوتەکانی کویت لەلایەن سوپای عێراقەوە،رۆژانە دەگەیشتەنزیکەی پێنج هەزارتەن .کەرێگەی لەتیشکی خۆرگرت و بوبەهۆی پیس بونی هەواو زەوی ناوچەکە،لەئێستاشدا بەرپرسان و ژینگەپارێزانی شاری بەسرە لەباشوری عێراق،ئاماژە بەبڵاوبونەوەی نەخۆشیە کانی شێرپەنجەو چەندین نەخۆشی کوشندە دەکەن. بەڵام بۆ ئێمە،ئەوەی کە جیاوازیەکە دروست دەکات و لەوڵاتانی تری بەرهەم هێنی دنیا جیامان دەکاتەوە ئەوەیەکە،ئاخۆحکومەت ودەسەلاتە خۆجێییەکانی لەمەڕئێمە(توانیویانە یاخود ویستویانە ژینگەی ناوچەی بەرهەم هێنەر پاک ڕاگرن و بیپارێزن)؟ تاچەند پرۆسەی دەرهێنان و کارکردن لە نەوت و گازدا لەهەرێمی کوردستان بەگشتی و لەم ناوچەیە بەتایبەتی (بەپێ ی ڕێنماییە ژینگەیی و ستانداردە جیهانیەکان) بەڕێوەدەچن؟.

ئایا بەدواداچون کراوە لەلایەن بەرپرسانی ژینگەی کەلاروناوچەکەورێکخراوەکانی ژینگەپارێزەوە،بۆدڵنیابونەوە لەپاکی و پیس نەبونی ژینگەو هەوای شارەکەو لەوبارەیەوە لەلایەن کۆمپانیا بەرهەم هێرەکان وحکومەتەوە ڕاو بۆچونیان وەرگیراوە ،یاخود دڵنیاییان دراوەتێ؟.

لەوبارەیەوە ڕێخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی وژینگەپارێزان،بەگومانن لەپاک بونی هەواو ژینگەی کەلار.

د.لیپ،کەیەکێکە لەئەندامانی ڕێکخراوی ژینگەپارێزی گەرمیان،پیس بونی هەوای گەرمیانی پشتڕاست کردەوەو

بەگوتەی ئەوبێت : دەبێتەهۆی پیس بونی ئاووهەواوخاکی ناوچەکە.هەروەهای زیاتری خستەسەرو وتی:

١- گازی دوەم ئۆکسیدی کاربۆن فڕێ دەدات ودەبێتە هۆی بەرزبونەوەی پلەی گەرما.

٢- گازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆنیش بلاودەکاتەوە کەلەهەموی ترسناکترەو گازێکی ناجێگیرەو بەردەوام بەدوای جێگیربوندا دەگەڕێت،بۆ ئەومەبەستەش گازی ئۆکسجین بۆخۆی ڕادەکێشێت وکاریگەری دەبێت لەسەر چینی ئۆزۆن وسەرەنجام دەبێتەهۆی بلاوبونەوەی چەندین نەخۆشی،لەناویاندا(شێرپەنجە). هەروەها،ئەگەر بڕێکی دیاریکراوی (١ ملگرام)بۆ هەرمەترێک،لەژورێکی داخراودا هەبێت،ئەوا مرۆڤ توشی لەهۆش خۆچون دەکات و دەبێت بەپەلە بگەیەنرێتە بەشی فریاکەوتن،بەزیادبونی بڕەکەشی دەبێتە هۆی مردن.

زانیاریە نافەرمیەکان ئەوەیان بلاوکردۆتەوە کەوا،ڕێکخراوە ژینگەپارێزەکان و خەم خۆرانی ژینکە،لەهەوڵ و کارکردندان بۆ زانینی ئاست و کاریگەریە سلبیەکانی پرۆسەی دەرهێنانی نەوت و گاز لەسەر ژینگەی کەلارو دەوروبەری،سەچاوەیەکیش ئەوەی بۆ ڕون کردینەوەکە، لەچەندمانگی ڕابوردودا ڕێکخراوێکی تایبەتمەند هاتوەتە ناوچەکەبەمەبەستی پیوانەکردنی ئاستی پیس بون وکاریگەریەکانی پرۆسەی دەرهێنانی نەوت لەناوچەکەداو،ئەنجامسی کارەکەشیان بەنادیاری ماوەتەوە. بەلام ئاخۆ بەچی گەیشتون و ئەنجامی کارەکەیان چی بوە،ئەوەیان بابەتێکی ترەو باس و خواسی زۆر هەڵدەگرێت.

هەرچی کۆمپانیای (گازپرۆمی روسیشە،ئەوا دڵنیایی داوە بەخەڵکەکەو بەلای ئەوەوە نەک هەرزیانی نیە،بەڵکو خەڵکی کەلارو دەوروبەری روبەروی خێروبێرێکی گەورەبونەتەوە.

پەیوەندیداریش بەم بابەت،جێ ی خۆیەتی ئاماژە بەچەند کێڵکەوبلۆکی نەوتی بکەین،کەنزیکن لەم شارەوەو بەشێوەیەک لەشێوەکان کاریگەرییان دەبێت لەسەر ژینگەی کەلارودەوروبەری. ئەوەی کەزانراوە تائێستا گەرمیان بەگشتی نزیکەی(١٥)بلۆکی نەوتیە،لەکۆی (٥٧) بلۆکی نەوت لەکوردستاندا.لێرەدا دەکرێت ئەوبیرانەی لەنزیک کەلارن بۆ سێ بەش جیابکەینەوە:

١- بیرەکانی حەسیرە(٢)بیر،میل قاسم (١) بیر.بێگومان ئەوەی کەزانراوە ڕۆژانە نزیکەی (٨٠٠٠)بەرمیل نەوت بەرهەم دەهێنن.

٢- لەسنوری گوندەکانی (شاکەل،کەواچەرمو،گۆبان)کاری لێدانی بیرو بەرهەمهێنان ئەنجام دەدرێت.

٣- بیرە نەوتەکانی چیاسورخ. ئەم بیرانە دەکەونە باکوری ڕۆژهەلاتی شارەکە،ئەم بیرانە لەڕوی دوری و

نزیکیان لەشارەکەوە،تارادەیەک لەوانی تر دورترن،بەڵام هێشتا نابێت کاریگەریە نێگەتیڤەکانیان پشت گوێ بخرێن و ڕەنگەبەشێوەیەک لەشێوەکان و بەرێژەی کەمتر لەدوو کۆمەڵەکەی پێشوو کاریگەری نەرێنیان هەبێت.

بۆیە ئەوەی کەگرنگە بوترێت وبخرێتە پێش چاوان ئەمەیە:

ئەگەر لەرابوردوداو پێش دەرهێنانی نەوت وگازی ناوچەکە،هاووڵاتیانی ئەم شارە دڵخۆش بوبن بەوەی کە،سەرلەبەیانیان و لەگەڵ دەرکەوتنی زەردەی دەم کەلدا،بۆ هەڵمژینی هەوایەکی پاک وبەنیازی ئەنجامدانی وەرزش وبۆلەش ساغییان،لەماڵەکانیان هاتبنەدەرەوە،ئەوا ئێستاوبۆ لەمەودوا،ڕەنگەنەتوانن کەش وهەوا پاک و بێگەردەکەی جارانیان چنگ بکەوێت.

چونکە لەئێستاداو لەگەڵ دەرکەوتنی ڕوناکیدا،هاووڵاتیانی کەلارو دەوروبەری،بینەری دیمەنی ئاسمانێکی دوکەڵاوی وناڕون دەبن.

کەوەک هەورێکی ڕەش ،لێرەولەوێ بەئاسمانی ناوچەکەدا بڵاودەبێتەوە.

ئەوەی کەگومانی لای خەڵکی کەلارو ناوچەکەش دروست کردوە ئەوەیە کە،تائێستاسەرچاوەیکی فەرمی وباوەرپێکراو نەبوەونیە، بیەوێت یاخود بتوانێت دڵنیایی بداتە خەڵکی ناوچەکەو هەموبەرپرسیارێتیەکی تەندروستی وژینگەیی بەرهەم هێنانی نەوت وگازی ناوچەکەبگرێتەئەستۆ.

بۆیە ئەوەی کەدەبینین لەئاگرو دوکەڵ و ئەوەشی کەدەبیستین لەزیانەکانی پرۆسەی دەرهێنانی نەوت و گازی ناوچەکە،بەسەریەکەوە ،بەڵگەی هەبونی ترسێکی لەسەرخۆو کوشەندەیە،کە ژێربەژێرو بەخشکەیی دەیەوێت دەشت ودەری کەلاروناوچەکە بتەنێت.وەک وتراویشە (هەزاردوژمنی ئاشکراوبینراو،لە یەک دوژمنی نەبینراوونەناسراو باشترە).

**سەرچاوەکان:**

*ماڵپەری کۆلیژی کارگێری وئابوری – زانکۆی بەسرە-د.سالم الجندی.١٩٩٢.

*رێکخراوی ژینگە پاریزی گەرمیان.



# ئەم یاریە فۆلکلۆریانە لەم ناوچەیەدا باو بوون

ئەحمەد محەمەد قادر

**١-گـوێزان :**

یاریەکی کورانەبوو,دووکەس یان زیاتر بە ویستی خۆیان هەریەکەی چەن گوێزێکیان کۆدەکردەوەو تێکەڵیان دەکرد(لای زۆری, کۆی گوێزەکان دەبوو لە هەردوو چنگدا جێگای بوایەتەوە ..),لە بن دیوارێ چاڵکیان هەڵدەکەند هێندەی جامیلکەیەک ,لە دووری نزیکەی (دوو بۆ سێ) مەتر شوێنێک دیاری دەکرا کە پێی لە سەر دانێیت و گوێزەکان بۆ چاڵکە هەڵدەی ,جا گوێزەکان کەم بوایە بە دەستێک و زۆریش بوایە بە هەردوو چنگ هەڵدەدران , چەند گوێزبکەوتایەتە چاڵکەوە دەبوە هی ئەو کەسە, جاری واهەبوو چاڵەکە پڕدەبوو لە گوێز دەنکە دەنکە گوێز دەکەوتنە کەناری چاڵکە ,نەدەزانرا لە چاڵەکەیە یان لە دەرەوەیە ,بۆ یەکلاکردنەوە دەنکە دەنکە گوێزەکانی ناو چاڵەکەیان دەردەهێنا تا دەگەشتە ئەو گوێزەی کە جێێی گومان بوو,ئەگەر گوێزی پاڵێت لابایە و بکەوتایەتە چاڵەکەوە ئەو هی ئەو کەسە بوو کە هەڵیدابوو بە پێچەوانەشەوە بە

هی دەرەوە ئەژمار دەکرا , ئەنجا کەسی دووەم ئەو گێزانەی هەڵدەدا کە کەوتبونە دەرەوەی چاڵەکە ئەم یاریە بەردەوادەبوو تا گوێزەکان تەواو دەبوو...

هی واهەبوو هێندە شارەزابوو,زۆری دەبردەوە ,هی واش هەبوو کۆڵ و مایە پوچ بوو, جا ئەوەی گوێزی نەمایە بۆی هەبوو بە پارە لەو کەسە بکڕێ کە زۆری بردبووەوە , ئەم کڕین و فرۆشتن و یاریە تا تاقەتیان بوایە بەردەوام بوو .

٢- قەمچان :

یاریەکی کچانە بوو (بە زۆری), دەکرا دوو کەس یان زیاتر بەشداربن ,لە سەر جێگا یان لە سەر خۆڵ بە خڕی دادەنیشتن ,پێنج بەردی خڕیان بە کار دەهێنا کە هەر یەکەی هێندەی تەشیلە (هەڵمات)ێک دەبوو ,یاریەکە بە نۆبە بوو, ئەوەی یارییەکەی دەست پێدەکرد بەردەکانی لە مەودای دەستەسڕێکدا هەڵدەدایە سەر ئەرزەکە ,یەکێ لە بەردەکانی هەڵدەگرت کە نزیک بووایە لە بەردێکی ترەوە ,ئەو بەردەی بە بەرزی (٣٠ بۆ ٤٠)سم هەڵدەدا تابەردەکە دەهاتە خوارەوە ئەم بەردێکی لە چوار دانەکەی زەوی هەڵدەگرت و هاوکاتە ئەو بەردەشی دەگرتەوە کە هەڵیدابوو, بێ ئەوەی لە کاتی هەڵگرتنی بەردەکەدا دەستی بەر بەردەکانی دیکەی ئەرزەکە بکەوتایە ,ئەوبەردەی دەخستە دەستەکەی تریەوە, هەمان یاری دووبارە دەکردەوە

بەردی دوەمیشی دەخستە سەرئەوبەردەی دەستەکەی دیکەی سێیەم و چوارەمیشی بە هەمان شێوە تاک تاک هەڵدەگرت و دەیخستە سەر ئەوانی دی, ئەم قۆناغە پێی دەوترا (یەکە).بەهەمان شێواز بەردەکانی دەخستەوە سەرزەوی یەکێکیانی هەڵدەگرت بە جۆرێک کە ئاسانکاری بکردایە بۆ هەڵگرتنی بەردەکانی بە دوو.. دوو (بە جووت),هەمیسان بەردەکەی دەستی هەڵدەدا تادەهاتە خوارەوە دەبوو دوو دانە هەڵگرێ بێ ئەوەی دەستی بەر هەریەک لە دوودانەکەی دیکە بکەوێ, دەیخستنە دەستەکەی تریەوە ,دیسانەوە بەردەکەی هەڵدەدایەوەو ئەم دوانەکەیشی هەڵدەگرت و دەیخستە سەر دوانەکەی دی,ئەم قۆناغە پێی دەوترا (دووە) , هەمان یاری دووبارە دەبووەوە ئەنجارە هەرچوار بەردەکەی بە دووجار هەڵدەگرت,جارێ یەک دانەو دووەم جار سێ دانە (سێیە), بەهامان شێوازی پێشو بەردەکانی فڕێدەدایە سەر زەوی دەبوو بە جارێک هەرچواری هەڵگرتایە (چوارە). دیسان بەردەکانی هەڵدەدایە سەر زەوییەکە دانەیەکی لێهەڵدەگرت وەک جارەکانی هەڵدەدایە بەرزی( ٣٠ بۆ ٤٠)سم تادەهاتە خوارەوە دانەیەکی لە بەردەکان هەڵدەگرت ,بێ ئەوەی بیخاتە دەستەکەی تریەوە یەکێ لە بەردەکانی دیسان هەڵدەداو دانەیەکی دیکەی هەڵدەگرت

,دەبوو بەم شێوەیە هەر پێنج بەردەکە لە یەک دەستیدا کۆکاتەوە بە بێ ئەوەی لە کاتی هەڵگرتنی بەردەکاندا دەستی بەر بەردی دیکە بکەوتایە ,ئەم قۆناغەش پێیدەگوترا (زیزە ,لە هەنێ ناوچەی تردا پێی دەڤوترا :لیلە ).

بۆ قۆناغێکی دیکە پەنجەی بالآبەرزەی دەخستە سەر دۆشاو مژەو لە گەڵ ئەسپێ کوژەی شێوەی نیمچە کەوانەیی لێدەکردو لە چەشنی نیوبازنەیی لە سەر زەوی دادەنا, پاشان بە دەستەکەی دیکە هەر پێنج بەردەکەی لە نزیک ئەو کونەی کە بە پەنجەکانی دروستی کردبوو بەنزیکی(٥ بۆ ٧)سم دادەناو بەرەو دواوە بەردەکانی ڕۆ دەکرد کە بەشێوەی یەک لە دوای یەکێکی نارێک بڵاو دەبوونەوە ,ئەنجا یەکێ لەبەردەکانی بە ئارەزوی خۆی هەڵدەگرت ,هەرکە هەڵیدەدا تادەهاتە خوارەوە دەبوو بێ ئەوەی دەستی بەر بەردێکی دیکە بکەوێ بەردێک لە چوار بەردەکەی زەوی هەڵگرێت و بیخاتە ئەو کونەوە کە بە پەنجەی (دۆشاو مژەو ئەسپێ کوژە)دروستی کردبوو,ئەم شێوە دووبارە دەبونەوە تا هەر چوار بەردەکەی دەخستە کونەکەوە ,دواجار ئەو بەردەشی دەخستە کونەکەوە کە هەڵیدەدا و ئەنجا هەردوو لەپی بە زەویدا دەداو چەپڵەیەکی دەکوتا ,ئەم قۆناغەش ناوی (کونە) بوو. (دیارە مەبەست لەم ناوە ئەو کونەیە کە بە دوو پەنجەی دروستی کردبوو ,بەردەکانی لێ دەکردە ژوورەوە...).

قۆناغی کۆتایی ,هەر پێنج بەردەکە دەخاتە یەک دەستیەوە ,جوان گرمۆڵەی دەکا ,بە نزمی هەڵیدەدا و هەوڵدەدات هەموویان یان زۆرینەیان بخاتە سەر پشتی لەپی (سەر پەنجەکانی..)ئەگەر دانەیەک یان دوو دانەی بکەونە سەر پەنجەکانی ئەوە بە خرچاو (کەوتوو) ئەژماردەکرێ ,خۆ ئەگەر سێ و زیاتر بوو,نەختێ دەوەستێ و پەنجەکانی دەجوڵێنێ بۆ ئەوەی بەردەکان خڕو ڕێک ببن ,ئەنجا بە خڕی هەڵیاندەدات , پێویستە بە جۆرێک هەمویان بگرێتەوە کە نوکی پەنجەکانی بۆ سەرەوە بێت و بە قەمچکردنەوە واتە بە پێچەوانەی کەوتنە ناو لەپ بیانگرێتەوە ,ئەم قۆناغەش پێی دەوترێت : (بەرەقەمچ)..ژمارەی ئەوبەردانەی کە لە دوو زیاترن و دەکەونە سەر پشتی دەستی و لە بەرەقەمچدا دەیانگرێتەوە ئەوەندە نمرە بۆ کەسەکە دەژمێردرێ ,هەرکام لە بەشداربوان زووتر گەیشتنە ئەو ژمارە پێوانەیەیی کە لە سەری ڕێککەوتون ئەوە براوەیەو (کۆپ یان قان )ێکی بۆ ئەژمار دەکرێت...

ئەم یاریەش زۆر باوبووە ,ڕەنگە لە سنوری گەرمیاندا کرابێ ,وردکاری و ژیری دەوێ ,لەپی گەورە سوود بەخشە ,ناوەکەشی (قەمچان ) لە دواقۆناغی یارییەکەوە

وەرگیراوە کە (بەرەقەمچ)ەو ویسکەیەکی گرنگ و هەستیارە...ناوەکەش کوردیەو لە چاوگی قەمچ کردنەوە وەرگیراوە.

٣- هەڕێوی ڕێوی :

یاریەکی کچانە بوو ,کۆمەڵە کچێ بە شێوەی بازنەیی دەستی یەکتریان دەگرت و سوڕیان دەخوارد دەستو جەستەیان بە جوانی و پێکەو لە سەر ئاواز (ئیقاع ,ریتم)ی :هەریوی...ڕێوی ,دەجولاند , کچێ بەستەکەی دەگوت و کچانیش بە یەک دەنگ دەیانگوت : هێی ,

هەڕێوی...ڕێوی....هێی

ڕێوی بێئیمان...هێی

شەریکی شەیتان...هێی

کەرەکەم سمۆڵە...هێی

لە دەشتی چۆڵە...هێی

ئاوم نەداوە...هێی

کوێرایم دایێ...هێی

نامە دەنوسم ...هێی

لە باڵی مێشێ...هێی

ئەویش بۆ (مەلەک)...هێی

دڵی نەێشێ...هێی...

مەلەک ناوێکی خوازراوە ,دەبوو ئەو ناوەی کە لە کۆتاییدا دەوترا کچێک بوایە لەو کچانەی کە لە نێو یارییەکەدا بەشدارە, بەستە بێژیش بە ئارەزووی خۆی ناوی دەبرد ,ئیتر بەستە بێژ دەبوە ئەو کەسەی کە ناوی براو یاریەکە بە

هەمان شێوە دووبارە دەبووەوە و تا دەهات گەرمترو خۆشتر هەڵدەبەزین و سنگ و قژو دەستی خۆیانیان دەجولاندو دەنگیان بەرزدەکردەوە...

دیارە ناوزەدکردنی ڕێوی لە یارییە فلکلۆریەکاندا نیشانەی فێڵبازی و کەتن کەری ڕێوی بوە, چونکە جوجەڵە یەکێکە لە بەرهەمە خۆماڵییەکانی ژیانی لادێ وەک سەرچاوەی ئابووری و لای کچ و کاڵن خۆشەویست بووە ,بۆیە پێویستی کردوە ڕێوی ناشیرین بکرێت و ناوی بخرێتە ناوێلەوە ,لە دونیای موسڵمانانیشدا شەیتان خراپەکارەو ئەوەی مرۆڤ دەیکات لە خراپیەکان ئۆباڵی دەخرێتە ئەستۆی شەیتان, بۆیە رێوی و شەیتان هاوجۆر کراون...

گویدرێژیش بۆ ژیانی لادێ گرنگ و سەرچاوەی بژێوی و کارئاسانی شوان و جوتیارەکان بووە ,کاتێ لە خزمەتکردنی کەم تەرخەم دەبن ,نزای خراپ لە ئەندامی گرنگ و شیرینی خۆیان (چاو)دەکەن...

بۆیە لە کوردەواریدا وتراوە : ئەوەی کەرێکی نەبێ , کەرێ ناهێنێ...!

٤ – قازو قولینگ :

قازو قولینگ باڵدارێکی کۆچەرییە ,لە زستانان دەهاتنە ناوچەی گەرمیان ,پیدەچێ کاتێ کوێستانەکان بەفر دەیگرت ناچار بن بۆ وەرزێ بێنە ناوچە گەرمەکان

,باڵدارێکی تا ئاستێ بەرزە فرو بە پشون بۆ فرین ,بەدەگمەن تەنهان ,بە زۆری هەرگەلێکیان (٦ و ٥٠)دەبن, زۆر وریایە ,لە هەرکوێ بلەوەرێن دانەیەکیان لە سەر قوتەو بەرزیەک دەبنە چاودێر, چونکە گۆشتیان خۆشەو زستانان بە ئێستاشەوە هەرچەندە زۆر کەم بونەتەوە , دێنە ئەم دەڤەرە ,زۆر سڵا لە مرۆڤ دەکەنەوە چونکە راوچیان زۆر مەراقی ڕاوکردیانن ,(گۆشتیان خۆش و بەتامن ),لە کاتی رۆیشتندا بە ریز دەفرن ,ئەگەر هەوا هەبێ بە هێزترینیان دەکەوێتە پێشیان و ئەوانی دیکە یەک لە دوای یەک ,خۆیان دەخەنە پەنای یەکتر بۆیە زۆر جار دەبینرێن شێوەی رۆیشتنیان لە ژمارە هەشت دەچێ...(گۆشتی خۆش و بەتامە..)

باوکم دەیگێرایەوە :

هەرکاتێ بە گەل دەهاتن ,دەنگیانمان لە حەواوە دەناسیەوە ,ئێمەش مێرد مناڵ بووین ,هەتا تێپەڕ دەبوون بە دەنگی بەرزو پێکەوە ئەم دێرەمان چەند جارێ دووبارە دەکردەوە :

قازو قوڵینگ گەل گەلی ,

سەلام دەکەین لە ئیمام عەلی...

دیارە لە ژوورەوە بەرەو خوار رۆیشتوون ,ئەمانیش (ئیمامی عەلی)یان خۆشویستووە و ئەم داواکاریەیان لە قازو قوڵینگ هەبووە ,ئەمەش کاریگەری ئایینە..



ڕەحیم حەمید عەبدولکەریم

# چەندپێشنیازێك بۆ سوودوەرگرتن لە ڕووباری (سیروان) بۆ گەشەدان بە شاری کەلار



بێگومان جوانترین شارەکانی دنیا ئەو شارانەن کە کەوتوونەتە لێواری ڕووبار ودەریا وزەریاکان وەکو شارەکانی لەندەن وبەرلین وپاریس و..هتد ، ولە عیراقدا شارەکانی بەغدا وبەسرە وموسڵ بەجوانترین شارەکانی عیراق دەژمێردران.

شاری (کەلار) لەو شارانەیە کە ڕووباری (سیروان) بە تەنیشتیدا تێدەپەڕێت وبەشێوەیەکی خێرا لەگەشەکردنی مرۆییدایە ، وپێدەچێت لە ساڵانی داهاتوودا ببێتە چوارەم گەورەشاری کوردستانی باشوور لەڕووی ئاوەدانی وبەرفراوانی وئابورییەوە ، چونکە پێگەیەکی جوگرافیایی نایابی هەیە ومەڵبەندی ئیدارەی گەرمیانە ونزیکە لە سنووری ئێرانەوە وسێ دەروازەی سنووریی لەگەڵدا هەیە(پەروێزخان ، تیلەکۆ ، پشتە) ، هەروەها نزیکە لە ناوەڕاست وپایتەختی عیراقەوە ، ونزیکە لە سەرچاوەکانی وزەوە وەکو نەوت وگاز(کێڵگەکانی حەسیرە وچیاسورخ) ، سامانی کشتوکاڵی وسەرچاوەی ئاوی زۆر باشە ، زەویی کشتوکاڵیی بەپیت وتەختی باشی هەیە ، بنەمایەکی مرۆیی ئیشکەر وکاسبکاری هەیە وچڕی دانیشتوانیی زۆر بەرزە ، وبەهۆی ناسەقامگیریی ڕەوشی ئەمنیی ناوچەکانی کوردنشینیی دەرەوەی هەرێم وای کردووە زۆرترین

ژمارەی ئاوارەی كوردی ئەو ناوچانە ڕوویكەنە شاری (كەلار) ودەوروبەری وتیایدا نیشتەجێبن.

لە ڕاستیدا ڕووباری (سیروان) وەكو بنەمایەكی گرنگی ئابوری بۆ ئەم ناوچەیە سوودێكی ئەوتۆی لێوەرنەگیراوە بەڵكو كەموكوڕییەكی زۆری لەخۆگرتووە لەوانە:

١.بوونی ژمارەیەكی زۆر لە غەسالەی چەو ولم لەنێو چەمی ڕووبارەكە وهەبوونی زیادڕەوییەكی زۆری هاوڵاتیان لە نێو چەمەكەدا.

٢.نارێكی ڕێڕەوی ئاوەكەی وكەمی پردی پێویست لەسەری بۆ مەبەستی پەڕینەوە .

٣.نەبوونی بەنداوی پێویست لەسەر (سیروان) لە نزیك شاری (كەلار) وسوودوەرنەگرتن لە سامانی ئاوەكەی .

٤. نەبوونی پرۆژەی گەشتوگوزاری لەنزیك ڕووبارەكەدا.

ئەم خاڵانەی سەرەوە بوونەتە ڕێگر لە نەشونماكردنی شاری (كەلار) وفراوانبوونی بۆ فەزایەكی والاتر ئەویش ئەوبەری (سیروان)ە ، ئێستا شاری (كەلار) گەمارۆدراوە بەو ڕووبارەوە وبواری فراوانبوونی لێگیراوە ، بەڵام لە ڕاستیدا پێویستە ئەو گەمارۆیەی لەسەر لابدرێت وڕووی ئاوەدانی ونیشتەجێبوونی نوێ ومۆدرین بچێتە ئەوبەری (سیروان)ەوە وڕووبارەكەش شار بكات بەدوولەتەوە ئەمبەری وئەوبەری ، وا لێرەدا هەندێ پێشنیاز دەخەمە ڕوو بۆ مەبەستی سوود وەرگرتن لە ڕووباری (سیروان) وبەم شێوەیەی لای خوارەوە خاڵبەندی دەكەم:

١.هەموو ئەو ڕووبەرە زەویانەی كە دەكەونە ئەمبەروئەوبەری لێوارەكانی (سیروان)ەوە بەشێوەیەكی یاسایی بخرێتە ژێر دەسەلاتی فەرمانگەكانی پەیوەندیدار وەكو (شارەوانی وگەشتوگوزار)ەوە بۆ ئەوەی دەستیان والابێت بۆ بەكارهێنانیان لە بواری ئاوەدانكردنەوەدا.

٢. لادانی هەموو زیادڕەوییەكانی سەر چەمی ڕووبارەكە ولادانی غەسالەكان وكارگەكانی چەو ولم ودۆزینەوەی شوێنی تر بۆیان دوور لە شاری (كەلار) ، ئەمەش بێگومان پێویستی بە بڕیارێكی ئیداریی یەكلاكەرەوە هەیە .

٣.هەوڵدان بۆ جێبەجێكردنی پرۆژەی بەنداوی(بەردەسوور)كە هەموو دیزاینەكەی ئامادەیە لە وەزارەتی كشتوكاڵ وسەرچاوەكانی ئاو ، ودروستكردنی پرۆژەی ئاودێری جۆراوجۆر وئاراستەكردنی ئاو بۆ دەشتی بەپیت وتەختی (بنكورە) ودەشتی(كەلار) بۆ زیاتر ئاوەدانكردنەوەی ناوچەكە .

٤.چاككردنەوە ڕێڕەوی ڕووباری (سیروان) لە نزیك گوندی(بەرلوت) ەوە تاوەكو نزیك گوندی(گردەگۆزینە) وبەجۆرێك ڕێكبخرێت بەڵكو بەشێوەیەكی ئەندازەیی ئاوەكەی دیاربێت وپانایيەكەی كەمبكرێتەوە وقووڵاییەكەی زیادبكرێت

به بەکاهێنانی دیواری ڕاگری کۆنکریتی بۆ مەبەستی بەکارهێنانی بۆ بواری گەشتوگوزاری.

٥.لە پایتەختی کۆریای باشوور(سیئۆڵ) ولەسەر ڕووباری (هان گەن)کە بەناوەڕاستی شارەکەدا گوزەردەکات (٢٣) پرد بۆ پەڕینەوەی لەسەر کراوە ، بۆیە لۆمەم نەکەن گەر پێشنیاری (٣) پرد بکەم لەسەر (سیروان) لە ئاستی سەرەتا وناوەڕاست وکۆتایی شارەوە ، وتاوەکو ئێستا تەنها دانەیەک لە کۆتایی شار لە نزیک گوندی(گردەگۆزینە)بۆ دروستکراوە.

٦.دروستکردنی دوو چین لە جادەی (کۆڕنیش) لەسەر لێوارەکانی ئەمبەر وئەوبەری ڕووبارەکەوە ودروستکردنی ڕێڕەو بۆ ئۆتۆمبیل وپاسکیلسوار وپیادە هەریەک بەجیا وجوانکاری وگوڵکاری وباخچەو وپەیکەرسازیی ناودارانی گەرمیان لەو نێوەندەدا ودروستکردنی ڕووناکیی ئەندازەیی و...هتد ، وبەستنەوەیان بە پردەکانەوە بەم شێوەیە دەبێتە ناوەندێکی گەشتوگوزاری دڵڕفێن لەسەر ئاستی هەموو کوردستان وبگرە عیراقیش .

٧. بۆ مەبەستی فراوانکردنی شاری (کەلار) پێویستە یەکەی نیشتەجێبوون لەوبەری (سیروان)ەوە دروست بکرێت وبۆ ئەوەش دەتوانرێت ڕووبەرە بەردەڵانیەکانی نزیک گوندی(دەورە)سودی لێوەبگیرێت ولە ڕێگای وەبەرهێنانەوە مەرجەکانی بۆ دانرێت ، ودەکرێت هاندانی وەبەرهێنان بدرێت بۆ دروستکردنی باڵەخانە وبینای ستوونی لەو بەری (سیروان) بە شێوەیەک ئەو شوێنە ببێتە بەشە نوێکەی شاری(کەلار)، هەروەها هاندانی کۆمپانیاکانی وەبەرهێنانی بواری گەشتوگوزاری بۆ نمونە لە نزیک (قەڵای شێروانە) کە ڕووبەرێکی باش ئێستا لەبەردەستی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی گەشتوگوزاری گەرمیانە.

لە کۆتاییدا وبۆ مەبەستی گەیشتن بەم ئامانجانەی لای سەرەوە پێویستە هەموو لایەنە پەیوەندیدارەان بەیەکدەنگی ویەک هەڵوێستییەوە کاری لەسەر بکەن لە دەزگاکانی حکومەت ورێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی وچالاکوانان و..هتد لە پێناو ئاوەدانکردنەوەی زیاتری مەڵبەندی گەرمیان.



محەمەد پیروەلی

# بیرۆکەی کردنەوەی قوتابخانەی وەلی دێوانەی سەرەتایی شەوانە

سەردەمانێک چ لەکاتی جەنگی ئێران و عێراق یاخود لەکاتی کردارە وەیشوومە و بەدناوەکانی ئەنفال زۆر جار ترس و دڵەڕاوکێ ئەکەوتە نێو قوتابیانی سەرەتایی بەتایبەتی گەنجان و مێردمنداڵانی پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی دەبووە هۆی وازهێنانی چەندین قوتابی لەبەر ئەو بارودۆخە ناهەموارانە کەهۆکاری زۆر بوو وەکو ئەوەی هەندێ جار باوک یا برا یا کەسوکاری قوتابیان پێشمەرگەبوون ئەمانیش بێبەش نەبوو لەچاودێری پیاوانی بەعس و داروودەستەکەی یاخود ڕاوەدونان دەبووە هۆی ئەوەی ئەم قوتابیانە لەگەڵ خێزانەکانیان بچن بۆناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش و هێزی پێشمەرگە . ئەو قوتابیانە لەخوێندن دادەبڕان .

هەندێ جار باوک یان برای قوتابی سەربازی هەڵاتوو بوون و بەرەی جەنگی عێراق و ئێرانیان بەجێ هێشتبوو و ئەمانەش هیچ بە سەرفرازی و دڵنیایی و ئاسوودەیی نەدەژیان بۆیە خێزانەکانیان هەر ڕۆژە لەترسی ڕژێم بەرەو شوێنێک سەری خۆیان هەڵدەگرت مناڵان لەخوێندن مەحروم دەبوون. بگرە ئەوکەسانە دەبران بۆ جەیشی شەعبی بەزۆرەملێ مناڵان بێ باوک و بێ سەرپەرشت دەمانەوە زۆرجار دەبووە هۆی وازهێنانیان لەخوێندن. ئەمانەو چەندین هۆکاری تر و زۆرتر، تاوەکو ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ و کۆڕەو و گەمارۆی ئابووری

و بێکاری و قاتوقڕی ئەمانە هەمووی بوونە هۆی دابڕانی کۆمەڵێکی زۆر لەقوتابیان و وازهێنانیان لەخوێندن.
دابڕانی قوتابیانی سەرەتایی بوو بە خولیایی مێشک و دەروونی من چۆن هەوڵێک بدەم بۆ گەڕانەوەی ئەم قوتابیانە بۆخوێندن و تەواوکردنی خوێندن ئەوسا بیرۆکەی کردنەوەی قوتابخانەیەکی سەرەتایی شەوانەم بۆهات چونکە تەمەنی زۆربەیان لەوەدا نەمابوون جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ دەوامی فەرمی ڕۆژانە.
ئەم بیرۆکەیە لەگەڵ هەردوو برای بەڕێزم: مامۆستا سرتیب عزیز بەڕێوبەری گشتی پەروەردەی گەرمیان و مامۆستا دارا احمد سەمین ئەوکاتە سەرۆکی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان- لقی گەرمیان بوو.
هەردووکیان مەردانە و دڵسۆزانە پشگیریان لێکردم و مامۆستا سرتیب عزیز قوتابخانەی وەلی دێوانەی سەرەتایی شەوانی بۆ کردینەوە.
خۆم بووم بە بەڕێوبەر و ئینجا هەوڵمدا مامۆستا بۆ قوتابخانەکە دابین بکەم، چەندین مامۆستای بەڕێز و دڵسۆز هاتن بەدەنگمەوە وەکو
١-مامۆستا چالاک عثمان مصطفی
٢-مامۆستا سامان حاجی حسن
٣-مامۆستا حسیب حمید فرج
٤-مامۆستا محمد فرج محمد امین
٥-مامۆستا احمد کریم
٦-مامۆستا فرج احمد
٧-مامۆستا رحیم محمد کاکل
٨-مامۆستا عثمان چاوشین
٩-مامۆستا اکبر حاجی حسن
١٠-مامۆستا سلیمان ویس مراد
١١-مامۆستا سالار فاضل بساط
١٢-حسن حیدر رۆستم
حاجی محمد کارگوزار بۆ قوتابخانە خوالێخۆشبوو
محمد سعید محمد علی لەگەڵ عبدالکریم حق مراد سەرپەرشتیاری پەروەردەیی و ئیدارەی قوتابخانە بوون و ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە هاندانی مامۆستایان و هەماهەنگی برایانە و دڵسۆزانەیان نواند .
مامۆستا حمید مجید مراد سەرپەرشتیاری یەکەم لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی گەرمیان هیچ دریغی نەکرد بۆ هەر ئیشێکی پێویست خوالێخۆش بوو مامۆستا مصطفی ڕەشید بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی گەرمیان دڵسۆزی خۆی نواند بۆ دابینکردنی هەر کەرەستەیەکی پێویست بۆقوتابخانە دووجاریش هات سەردانی قوتابخانەکای کرد دڵ ئارامی خۆی نواند بۆ قوتابخانە و قوتابیان چونکە زۆربەیان گەورە و پیاو بوون و مامەڵەکردن و هەڵسوکەوت. لەگەڵیان جیاواز بوو
تاکو ئێستاش دەوام بەردەوامە لەو قوتابخانەیە و چەندین قوتابی دەرچوون و خوێندنی خێرایان هەڵبژارد قۆناغەکانی ناوەندی و دواناوەندیان تەواو کردوو هیوادارم قوتابخانەی وەلی دێوانەی شەوان



# دامەزراندنی (مۆزەخانەی شارستانی گەرمیان) لە کەلار، وەك چوارەمین مۆزەخانەی شوێنەواری لە هەریمی کوردستان.


محەمەد عەلی کەریم

شوێنەوارناس

مۆزەخانەی شارستانی گەرمیان




دوای ئەوەی لە ساڵی(٢٠٠٩) پرۆژە بینای مۆزەخانەکە بە کوژمەی (٣٠٠) ملیۆن دینار گەڕایەوە, لە ساڵی ٢٠١١ دەستکرا بە جێبەجێکردنی. لە سەرەتادا بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان تەنها چەند پارچەیەکی کەمی شوێنەواری هەبوو, کە نەدەتوانرا تەنها دوو مێزی پێ (نمایش) بکرێت, ئەمەش لە لایەکەوە پاڵنەرێک بوو کە سەرەتا چالاکیەکان لە کاری هەڵکۆڵینی شوێنەواری و هۆشیاری شوێنەواری چڕبکەینەوە بە مەبەستی دۆزینەوە و کۆکردنەوەی پارچەی شوێنەواری. خۆشبەختانە لە بەر ئەوەی فەرمانبەرانی بەڕێوەبەرایەتیمان لە هەموو بەشەکان هەمیشە بە گیانی هاوکاریەوە وەک یەک تیم کاریان کردووە, بڕیار درا بە دروستکردنی لیژنەیەکی گشتگیر بە سەرپەرشتی (جێگری بەڕێوەبەر سالح محمد سەمین) و ئەندامیەتی( جمال محمد, محمد علی, سامان رشید, نەوزاد لەتیف, ئاوات ئەحمەد, سەروەت حەمدان, هوشیار حسن, ئەحمەد ئیسماعیل, زەینەب علی) ئەم لیژنەیە بە پێی توانا بەشدار بوو لە هەموو پرۆژەکانی ( کنەوپشکنین, نۆژەنکردنەوە, هۆشیاری شوێنەواری, تۆمارکردنی پارچە شوێنەوارییەکان, رووپێوی شوێنەواری, ئامادەکردنی هۆڵەکانی مۆزەخانە).

دواتر لە ساڵی (٢٠١٣) ستافی





(مۆزەخانەی شارستانی گەرمیان) دامەزرا, بە لێپرسراوێتی ( شوێنەوارناس/ محمد علی کریم) و ئەندامیەتی هەرسێ شوێنەوارناس (سەروەت حەمدان, هبە مونزیر, زینب علی).

بە هۆی ئەو پرۆژانەی ئەنجامدران لە بواری (کنەوپشکنینی شوێنەواری) لە نێوان ساڵەکانی (٢٠١٢ – ٢٠١٤), توانرا کۆمەڵیک پارچەی شوێنەوار گرنگ کۆبکرێنەوە. هەروەها لە ڕێی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری شوێنەواری و پێشکەشکردنی پارچەی شوێنەواری لە لایەن خەڵکی خەمخۆر و شوینەواردۆست, توانرا کۆمەڵیک پارچەی تری شوێنەواری دەستبخرێت, گرنگترینیان ئەو پارچانە بوون کە هاولاتی (پشتیوان نوری ابراهیم زەنگەنە) لە شاری چەمچەماڵەوە پێشکەشی کردین, پارچەکان ساڵانێک بوو لای ئەم هاولاتیە پاریزگرییان لێکرابوو, بە ووتەی ناوبراو بە دوای شوێنێکی فەرمیدا دەگەڕا لە گەرمیان بۆ ئەوەی ئەم پارچانەی لێ بپارێزرێت.

لە پاش دەستخستنی کۆمەڵێ پارچەی تری شوێنەواری,لە سەرەتای ساڵی (٢٠١٤) دەستکرا بە ئامادەکاری کردنەوەی یەکێک لە هۆڵەکانی مۆزەخانە. سەرەتا بە بەشداریکردنی خوول و بینینی مۆزەخانەکانی تری هەریم

دەستپێکرد لە لایەن ستافی مۆزەخانە و شوێنەوارناسانی تری بەڕێوەبەراتیەکە, لێرەدا مۆزەخانەی سلێمانی هاوکارمان بوو لە خوولەکانی چۆنێتی ( تومارکردن و صیانە)ی پارچە شوێنەوارەکان, جێی ئاماژە پێکردنە کە لێبراوانە بەڕێز( هێمن نوری) شوێنەوارناس لە (بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی) هاوکارمان بووە. لە پاشتر کۆمەڵی لیژنەی بچووک دروستکرا و سپیردرا بە:

*ئامادەکردن و نۆژەنکردنەوەی پارچە شوشەکان ( شوێنەوارناس/ جمال محمد).

*ئامادەکردن و نۆژەنکردنەوەی پارچە گڵێنەییەکان ( شوێنەوارناسان/ محمد علی , نەوزاد لتیف, سەروەت حمدان).

*ئامادەکردن و نۆژەنکردنەوەی پارچە کانزا و دراوەکان ( شوێنەوارناس نەوزاد لەتیف).

*وێنە و تابلۆکان (شوێنەوارناس محمد علی).

هەروەها توانرا لۆگۆیەک بۆ مۆزەخانەکە ئامادە بکرێت, ئەمەش شوێنەواری (نەخشی دەربەند بێلوولەیە لە مەیدان, سەدەی ١٩ بۆ ٢١ پێش لە دایکبوونی مەسیح) هێلکاریی لۆگۆکە لە لایەن شوێنەوارناس (محمد علی) کیشراوەتەوە و خودی لۆگۆکەش لە لایەن بەڕێز (سەیوان ئەمین) ئامادەکراوە.

وەک هەنگاوی یەکەم توانرا لە ٢٠١٤/٣/١٦ بۆ یەکەمین جار لە گەرمیان





یەکێک لە هۆڵەکانی مۆزەخانە بکرێتەوە. هۆڵەکەش بیست و یەک مێزی لێ نمایش کرا. دیاری کردنی ئەم رۆژەش وەک درۆشمێک لە (رۆژی وێران کردنی شارێک, مۆزەخانەیەکی شارستانی دەکرێتەوە) چونکە ٣/١٦ رۆژی کیمیابارانی شاری هەڵەبجە بوو.

ساڵی دواتر دوای بەردەوامیی چالاکیەکان لە بواری کنەوپشکنین و رۆپێوی شوێنەواری و کۆکردنەوەی کۆمەڵێک پارچەی تری شوێنەواری, لە ٢٠١٥/٦/١٦ هۆڵی دووەمی مۆزەخانەکە کرایەوە. مێژووی ئەو پارچانەی لەم مۆزەخانەیە نمایش کراوە, لە (چاخی بەردینی نوێ) وەوە دەست پێدەکات تاوەکوو کۆتا (چاخی ئیسلام)ی کە سەردەمی عوسمانیەکانە.

ئەگەرچی بە هۆی باردۆخی ئەم چەند ساڵەی خراپی باری ئابووری نەتوانراوە پەرە بە مۆزەخانەکە بدرێت لە رووی فراوانکردنی هۆڵەکان, بەڵام لە ئێستادا لە پرۆژەی مۆزەخانەکەدایە کە بە شێکی نوێ لە یەکێک لە هۆڵەکانی بکرێتەوە, ئەمەش بریتیە لە پرۆژەی چۆنێتی دۆزینەوە و دەرهێنانی پارچە شوێنەوارەکان لە گردێکی شوێنەواری, لە رێی دروستکردنی گردێکی قەبارە بچووکی دەستکرد بە کۆمەڵی پارچەی شوێنەوارییەوە. ئامانج لەم پرۆژەیە پیشاندانی کاری کنەوپشکنینە بە (خوێندکاران) بە تایبەت و ئەو هاولاتیانەی سەردانی مۆزەخانەکە دەکەن. هەروەها لەگەڵ (دانانی شاشە) یەکی گەورە بۆ پیشاندانی کۆمەڵی ڤیدیۆ لە بواری زانستی شوێنەواردا.

ئیستا مۆزەخانەکە بووە بە شوێنێکی شوێنەواری و گەشتیاری گرنگ, کە رۆژانە هاوولاتی و خوێندکارانی هەموو قوناغەکانی خوێندنی پەروەردەیی و خویندکارانی زانکۆ و پەیمانگەن سەردانی دەکەن, هەروەها لە کاتی پشووە گەورەکانی ساڵ جێی کراوەتەوە لە پرۆگرامی فێرخۆزانی هەموو خوولە جۆر بە جۆرەکان لە ناوچەکە.

# مێژووی دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان و کار و چالاکییەکانی



شکر محمد حیدر
بەڕێوەبەری شوێنەواری گەرمیان



بوونی دەزگایەکی شوێنەواری لە هەموو شار وشارۆچکەیەکدا پێویستییەکی گرنگە، بەمەبەستی پاراستن وچاودێریکردنی شوێنەوار, لەبەر ئەوەی شوێنەوار ناسنامەیەکی راست و گرنگ و بەهێزە بۆ سەلماندنی ئەو گەلەی لەو ناوچەیەدا دەژین, لە هەمانکاتدا گەورەترین چەکی ئەو نەتەوەیەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی گۆڕینی دیمۆگرافی دژ بە نەتەوەیەکی تری داگیرکەر.

هەمووان ئەو راستیە دەزانین ناوچەی گەرمیان یەکێک بوو لەو ناوچانەی لە سەردەمی رژێمی بەعسدا گەورەترین شالاوی تەعریب و راگواستنی تێدا ئەنجامئەدا, هەر بۆیە لە سەردەمی حوکمی رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق هیچ فەرمانگەیەکی شوێنەواری بوونی نەبووە لە شارەکانی ناوچەی گەرمیاندا, وەهیچ کارێکی یان پرۆژەیەکی شوێنەواری تێدا ئەنجام نەدرابوو, وەک پرۆژەی (کنە وپشکنین و نۆژەنکردنەوەی شوێنەوارەکان). بە پێچەوانەوە بەردەوام لە هەوڵی تێکدانی شوێنەوارەکاندا بوون, چی بە رووخاندن یان دروستکردنی سەنگەری سەربازی لە

سەر گردە شوێنەوارییەکان .

یەکێک لە کارە پیرۆزەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەوە بوو, لە ساڵی (١٩٩٨) فەرمانگەی شوێنەواری لە شاری کەلاردا دامەزراند لە ناو بینای قەڵای شێروانە. بەڕێز ( حسن علی سلیم بەگ ) وەک لێپرسراوی ئەو بنکەیە دانرا, ئەوەش بوو بە بەردی بناغەی دروستبوونی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان. گرنگی ئەو بنکەیە ئەوە بوو شوێنەوارەکانی ناوچەی گەرمیان خاوەندارێتی بۆ دروستبوو تا رادەیەک توانرا چاودێری شوێنەوارەکان بکرێت، بەڵام لە بەر ئەوەی حکومەتی هەرێم بەهۆی شەری ناوخۆوە ببووە دوو ئیدارەیی ونەبوونی داهات و هەروەها دوو گەمارۆی ئابووری لە سەر بوو, نە دەتوانرا کاری خزمەتگوزاری لە هەموو بوارەکاندا ئەنجامبدرێ و ئەم بنکەیەش بۆی نەکرا هیچ پرۆژەیەک لە بواری شوێنەواریدا ئەنجام بدات.

## دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان :

دوای پرۆسەی ئازادی عێراق لە (٩ / ٤ / ٢٠٠٣ ) کە رژێمی عێراق رووخا، لە ساڵی ( ٢٠٠٤ ) بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان دامەزراوە. لە بەر ئەوەی ناوەندی ئیدارەی گەرمیان لە دەربەندیخان بوو ئەو کات بەڕێوەبەرایەتیەکەش لە هەمان شاربوو, بەڕێوەبەرەکەشی شوێنەوارناس (کمال نوری معروف) بوو. لەو سەردەمەدا توانرا جۆگەی گاوری لە کەلار لە ساڵی ( ٢٠٠٥ نۆژەن بکرێتەوە. دواتر لە ساڵی





٢٠٠٨ ) بەڕێوەبەرایەتییەکە گوێزرایەوە بۆ شاری کەلار. لە ( ١٣ / ٥ / ٢٠٠٩ ) بە پێی فەرمانی وەزاری ژمارە ( ١٢٣٨ ) ( شکر محمد حیدر ) وەک بەڕێوەبەری شوێنەواری گەرمیان دامەزرا.

هەموو دەزانین دۆخی ئابووری عێراق و هەرێمی کوردستان گەشەیەکی باشی بەخۆیەوە بینی, هەزاران پرۆژەی خزمەتگوزاری ئەنجام درا, وە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیانیش پشکی خۆی بەرکەوت و چەندین پرۆژەی گرنگ لە بواری شوێنەواری ئەنجامدران.

هەر چەندە بەهۆی چەند کۆسپ وگرفتێکەوە وەک پێویستی ناوچەکە نەبوو وەک ئەمانەی خوارەوە :

١. نەبوونی فەرمانبەری پسپۆری شوێنەواریی و ئەندازیاری شارەزای شوێنەواری وەک پێویست.

٢. دەزگای شوێنەوار هەر جارە و سەر بە وەزارەتێک بوو ، ئەوەش بەشێوەی پەراوێزی حیسابی بۆ دەکرا .

٣. پاڵپشتی نەکردنی لێپرسراوی باڵا بەڵام ( هەولێر – سلێمانی – دهۆک ) لێپرسراوە باڵاکان هاوکاریان دەکردن .

## کۆمەڵێك لە چالاکیەکانی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان

### هەڵکۆڵینی شوێنەواری

١- هەڵکۆڵینی شوێنەواریی لە (شوێنەواری تەپەی ڕەحیم), لە ساڵی ٢٠١٢ بۆماوەی یەک وەرز.

٢- هەڵکۆڵینی شوێنەواریی لە (شوێنەواری کانی ماسی) بۆ ماوەی سێ وەرز, لە

ساڵی ٢٠١٦ , ٢٠١٧ ,٢٠١٨, تا ئێستاش بەردەوامە .

٣- (هەڵكۆڵینی ڕزگاری) شوێنەواری لە گۆرستانی تۆپ عەسكەر لە ساڵی ٢٠١٣.

٤- (هەڵكۆڵینی ڕزگاری) شوێنەواری لە تەپەی قەڵای شێروانە (دوو جار), لە كاتی دەركەوتنی چەند پاشماوەیەكی شوێنەواری بە هۆی ڕاماڵینی چینی سەرەوەی شوێنەوارەكە بە هۆی باران بارینەوە ٢٠١٢- ٢٠١٦.

٥- (هەڵكۆڵینی ڕزگاری) شوێنەواری لە ناو بازاڕی شاری كەلار لە ساڵی ٢٠١٢.

٦- (هەڵكۆڵینی ڕزگاری) شوێنەواری لە پاركی شاری یاری كەلار لە ساڵی ٢٠١٦.

٧- (هەڵكۆڵینی ڕزگاری) شوێنەواری لە گۆڕگردۆلكەی سەرقەڵا, دوای دەركەوتنی شوێنەوارەكە بەهۆی پرۆژەیەكی ئاوی ماڵان ٢٠١٣.

٨- (هەڵكۆڵینی ڕزگاری) شوێنەواری لە گوندی بەرلوت (٢٠١٢) و (٢٠١٣ ).

٩- (هەڵكۆڵینی ڕزگاری) شوێنەواری لە گوندی بەردەسوری كۆن, بۆ ماوەی (٢) دوو ڕۆژ (٢٠١٤) .

## نۆژەنكردنەوەو پاراستن

١- نۆژەنكردنەوەی سێ دانە لە قوللەكانی سەردەمی عوسمانی لە نێوان كەلار ـ دەربەندیخان, لە ساڵی ٢٠١٢ و ٢٠١٦.

٢- نۆژەنكردنەوی دوو ئاسیا و (ئاشی كۆن ) لە شاری كفری ٢٠١٢.

٣- نۆژەنكردنەوەی دوو بەشی جۆگەی گاوری ٢٠٠٥.

٤- بە گەشتیاری كردن و نۆژەنكردنەوەی شوێنەواری گۆڕگردۆلكەی سەرقەڵا ٢٠١٤.

٥- نۆژەنكردنەوەی قەڵای شێراوانە ٢٠٠٦.



## پاراستن

١- دروستکردنی دیواری ڕاگر بۆ (گردی شێروانە) قەڵای شێروانە ٢٠١٢-٢٠١٣.

٢- دروستکردنی پەرژینی تەلبەند بو شوێنەواری کۆشکی حەوش کوڕو ٢٠١٦.

٣- دروستکردنی پەرژینی تەلبەند بۆ خانوی مەجید پاشا ٢٠١٦.

٤- دروستکردنی تابلۆی شوێنەواری بۆ هەندێک لە شوێنە شوێنەوارییەکانی ناوچەی گەرمیان ٢٠١٦.

## ڕووپێوی شوێنەواری

١- ڕووپێوی شوێنەواری لە ناحیەی مەیدان و بە شێک لە ناحیەی پشتە ٢٠١٤.

٢- ڕووپێوی شوێنەواری بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان لەگەڵ ژینگەی عێراقی لە ساڵی ٢٠١٣ .

٣- ڕووپێوی شوینەواری بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان لە گەڵ هەردوو زانکۆی گلاسکۆو دارتموس لە سالی ٢٠١٢ دەستپیکرد و تا ئێستا بەردەوامە.

٤- روپیویکردنی هەندێ لە شوێنەوارەکانی ناوچەی کفری لە چەند کاتێکی جیاواز ٢٠١٥.

تا ئیستا نزیکەی ٨٥ شوێنی شوێنەواری نوێ لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان تۆمارکراوە, هەورووەها لە نەخشەی ئەتلەسی عێراقی ساڵی ١٩٧٠





نزیکەی ٦٠ شوێنی شوێنەواری تۆمارکراوە. لە دوای گرێبەستی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان لەگەڵ زانکۆی گلاسکۆو کۆلێجی دارتموس, ژمارەی شوێنەوارە تۆمارکراوەکان گەیشتونەتە ٢٠٠ شوینی تۆمارکراو.

بەشێک لەم شوێنەوارانە پێشتر تۆمارکراون دووبارە تۆمارکراونەتەوە بۆ ئەوەی سنوری شوێنەکان دیاری بکرێن و زانیاری زیاتر تۆماربکریت لەسەر سەردەم و بارودۆخی شوێنەوارەکان.

## بڵاوکراوەکان

١- دروستکردنی ڕیبەری شوێنەواری بۆ ناساندنی شوێنەوارەکان لە ساڵەکانی ٢٠١٠ و ٢٠١٤ .

٢- چاپکردنی ٤٠٠ تیراژ لە یاسای شوێنەوار و کەلەپوری عیراقی, هەمواری ساڵی ٢٠٠٢ز.



# قەڵای پاشا



مەحمود پاشا



### قەڵای پاشا (کۆشکی محمود پاشای جاف)

دەکەوێتە گوندی تازە دێ بە دووری (٩ کم) لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەلار. ئەم پاشماوەیە کۆشکێکی دوو نهۆمییە زیاتر لە کاروانسەرایەک دەچێت بەهۆی ئەو تایبەت مەندییانەی تێدایە بەڵام بیناکە بە قەڵای پاشا ناوبانگی دەرکردوە.
کۆشکەکە لە لایەن (محمود پاشای جاف) دروستکراوە ومێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٩٥ ز)، جگە لە بینا سەرەکیەکەی کۆشک لای باکورەوە بینایەکی تری لاکێشەیی هەیە کە پێدەچێت تەرخان کرابێت بۆ کۆگا و جێگەی تایبەتی ئەسپ و ئاژەڵی باربەر، لای باشورەوە بینایەکی تری بچوک کە پێکهاتووە لە چەند ژوورێک بەسەر بەرزاییەکەوە دروست کراوە پێدەچێت وەک وەستگەیەکی پێشوازی بووبێت بۆ کۆشکەکە.

### قصر محمود باشا الجاف (قلعة باشا)

يقع هذا القصر في قرية (تازه دي) والتي تبعد حوالي (٩ كم) شمال شرقي قضاء كلار. يتألف هذا القصر من طابقين على شكل خان لما تتميز به من مميزات خاصة. هذا القصر بني من قبل (محمود باشا الجاف) حوالي سنة (١٨٩٥ ميلادية) واضافة الى القصر نفسه يوجد بجواره آثار بناء ذات قاعدة مستطيلة الشكل كان يستخدم كمخازن او اسطبلات للافراس وحيوانات اخرى. والى الجنوب من القصر يوجد على مرتفع مبنى صغير يتكون من عدة غرف يعتقد انه كان مركزا لإستقبال زوار القصر.

### Mahmoud Pasha Jaff Palace (Castle of Pasha):

This palace is located in the village (Taza de), which lies about (9 km) north-east city of Kalar, consists of two floors of this palace in the form of Khan due to its special characteristics .
This palace was built by (Mahmoud Pasha Jaff) about a year (1895 AD) in addition to the palace itself is located near the remains of a building with a rectangular shape was used as warehouses or stables for horses and other animals.
And to the south of the palace there is a small building on High composed of several rooms was believed to be a reception center for visitors Palace.





# دەکرا پێگەی کەلار لە ئێستا باشتربوایە

محەمەد عەلی وەلی

ئێستا کەلار خەریکە نیوسەدە بەسەر بەقەزا بوونیان تێئەپەڕێت، بەڵام هێشتا لە رووی پێگەی ئیدارییەوە هەر ئەو قەزایەیە کە بەرلە ٤٩ ساڵ بووە قەزا.

کەلار وە بەراوردکردنی لەتەک قەزای ئامرلی- یا، کە مانگی کانونی دووەمی ساڵی ٢٠١٧ بووەتە قەزا، هەر قەزایەکە و هیچی تر، کە دانیشتوانەکەی ژمارەیان دەگاتە ٤٤٢٠٢ کەس، بەپێی تازەترین سەرژمێری وەزارەتی پلاندانی عێراق، لە ساڵی ٢٠١٤ دا، تازەترین قەزایش کە هێشتا ساڵێک وەسەر وەقەزابوونیان تێنەپەڕییە، ئەویش هەر قەزایە، حکومەتی عێراق چۆن مامەڵە لەتەک قەزایەکی وەک قەزای حوڕ و حوسەینییە لە کەربەلا دەکات، هەر ئاوایش مامەڵە لەگەڵ کەلارا ئەکا.

کەلار ئێستا بە هەموو پێوەرێک لەو قەزایانە گەورەترە، خاوەنی چەندین خاڵی بەهێزە، کە ئەگەر بتوانرێت سودیان لێوەربگیردرێت، پێگەی کەلار لە ئێستا باشتر و بەهێزتر بکا، کەچی حکومەتی ناوەندی عێراق، وەک هەر قەزایەکی تری مامەڵەی لەتەکا ئەکا، بۆیە دەکرێت، ئەو پرسیارە لە خۆمان و بەرپرسانی ئەم شارە و ئەو کورە کەلارییانەی لەیرەوە چوونەتە ناوەندەکانی بڕیار و دەسەڵات بکەین، دوای ئەو هەموو

ساڵە لە قەزابوونی کەلار پێگەی کەلار لە چ ئاستێکدایە؟! دیارە ئەو راستییەش ئەزانم کەلار لە سنوری ئیدارەی هەرێمدا وەک ناوەندی ئیدارەی گەرمیان مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێت، یەلام لە تۆمار و قەیدی عێراقی و هەرەمی ئیداری عێراقا، هێشتا کەلار هەمان ئەو قەزایەیە کە سەربە پارێزگای سلێمانییە، لە کاتێکدا کەلار خاوەنی چەندین تایبەتمەندی و خاڵی گرنگ و گەورەیە، بۆئەوەی ئەم شارە بێنازە لە قەزایەک زیاتر مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

کەلار خاوەنی ئەو رووبەرە فراوانەیە، کە لە رووی رووبەر و دانیشتوانەوە لە هەندێک وڵاتی دنیا گەورەتر و زۆرترە، لە رووی جوگرافی و ئابوورییەوە دەکەوێتە ناوەڕاستی شادەماری کەسابەت و بازرگانی ناوەڕات و باکوری عێراق، لە پیت و ریژەنی خاکەوە لە ناوچەکانی تری عێراق و هەرێم کەمتر نییە، لە رووی هێز و سەرچاوەی مرۆیی و خەڵکی ئەکادیمییەوە بەشی خۆی هەیە (ئەگەرچی تێبینییەکە لەسەر ئەم خاڵەیە)، هاوکات بوونی سەرچاوەیەکی وەک چەم و رووباری سیروان لە سەرچاوەی نەوتەکەی کەمتر نییە کەبەو ساڵانەی دوایی دەستکراوە بە دەرهێنان و فرۆشتنی، لە کاتێکدا سیروانەکەی بووتە شوێنی خانکانی خەڵکە بێنازەکەی و نەوتەکەشی بووەتە نیقمەت بۆ خەلکەکەی لە جیاتی ئەوەی ببێتە نیعمەت بۆی.

لە رووی شوێنەوار و مێژووی ژیان و گوزەران لەم ناوچەیە، هەرچەندە ناوچە شوێنەواری و کۆنەکانی لە لێواری لەناوچوون و فەتاندان، بەڵام کەلار لە زۆرێک پارزگاکانی عێراق کۆنترە، کەچی کۆنی و دێرینی و رۆچوونی لە مێژوودا هێشتا نەبووەتە مایەی ئەوەی ئاورێکی جدی لە کەلار و پێگە ئیداری و گەشتیاری و بازرگانییەکەی بدرێتەوە، ئەگەرچی ئەو سروشت و ئاوەی لە کەلارا هەیە، بەهۆی سیروانەوە، ئەگەر لە هەر شوێن و وڵاتێکی تردا بووایە، ئێستا کرابووە سەنتەری گەشتیاری ناوچەکە!.



# دەروازەکانی هاتنەناووەی خەڵکی گوندنشینەکان بۆ شاری کەلار لە پرۆسەی ئەنفالدا

فەتاح تەنیا

شاری کەلار خاوەنی سنوورێکی فراوانی جوگرافییە، بۆیە چەند دەروازەیەکی هاتنەناووەی هەیە، بۆگەیشتن بە سەنتەری شار، پرۆسەی ئەنفال کە بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی گوندنشینەکان و جێگیربوونیان لە سەنتەری قەزا و ناحییەکان و ئۆردوگا زۆرە ملێکان، بۆیە شاری کەلاریش لەم پرۆسەیە بەدەر نەبوو، بەم پێیەش لە پرۆسەی ئەنفالی سێ دا زۆرترین خەڵکی گەرمیان بەرئەم شاڵاوە کەوتن، چونکە خەڵکی ناوچەی گەرمیان هیچ دەروازەیەکی هاتنەناووەی نەدەزانی کە ببێتە هۆی ڕزگاربوونی لە پرۆسەی ئەنفالدا، ئەمەش کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر زۆری ژمارەی ئەنفال کراوەکان لە ناوچەی گەرمیان بەو ئەندازەیە کە ئەنفالی سێ بە گەورەترین و زۆرترین ژمارەی ئەنفال کراوەکان دێتە ئەژمار، کە تەواوی ناوچەکە لەم پرۆسەیەدا بەرکەوتەیان هەیە مەگەر بەکەمی نەبێت، بۆیە لێرەدا باسی چۆنیەتی قۆناغەکە ناکەین بەڵام تیشک دەخەینەسەر ئەوەی ئەم دەروازانە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست شیکاری بۆبکەین لە ناوچەکە، چونکە ناوچەکە بە تەواوی کۆنترۆڵ کرا بوو بە زەحمەت خەڵکی گوندنشینەکان ڕزگاری دەبوو لەو پرۆسەیەدا، چونکە



چــواردەورەی شــاری کــەلار بە مۆڵگەی سـەربـازی دەورە درابـوو هـەر لـە سەر شـێروانە تـاوەکـو بەرزاییـەکـانی گـوندی تووران و شۆڕدەبووە بۆ گوندی سەیدە و بەرزاییەکانی گوندی دێبنە هەتاوەکو گردەگۆزینە لەخوارووی شاری کەلار، ئەم مۆڵگانە بە شێوەیەکی چڕوپڕ چاودێری ناوچەکەیان دەکرد، هـەروەهـا پرۆسـەی ئەنفال و هـاتـنـەنـاوەوەی خـەڵـک زیـاتـر ئەوانەی کەدەربازبوون لـەم ڕێگایانەوە بوون وەک:

١. چەمی تازەدێ .

گوندی تازەدێ کە دەکەوێتە سەرەوەی شـاری کـەلار چەمێکی گـەورەی لێیە کە دەروازەیـەکـی گـرنـگ بـوو بـۆ ئـەوانـەی کە لە پرۆسـەی ئەنفالدا ڕزگـاریـان بوو، خەڵکی گوندەکەش هاوکارییان دەکردن و خەڵکەکەیان دەگێڕایەوە بۆ ناو شاری کەلار بۆ ئەوەی بیانپارێزن لە سەربازەکانی ڕژێمی بەعس و تووشی گرتن و ئازاردان یـان سـەرنگـوم کـردن نـەبـنـەوە، لـە ساڵی ١٤/٤/١٩٨٨دا ئەم دەروازانە و خەڵکەکەی ڕۆڵـی کـی بـەرچـاویـان بینی بـۆ ئـەوەی کـەمـتـریـن خـەڵـکی گوندنشینـەکان بـەر شاڵاوی ئەنفال بکەون.

٢. گوندی بەرلوت .

دەکەوێتە سەرەوەی شاری کەلار و سەر چەمی سـیـروان شوێنێکی نزیک و باش

بوو بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی گوندنشینەکان لە ١٩٨٨/٤/١٤دا، چونکە نزیک بوو لە شاری کەلار و ڕووباری سیروانەوە، ڕێنوێنی خەڵکیان دەکرد تاوەکو لە شەواندا خۆیان بگەیەننە گەڕەکی گازینۆ و بەردەسوور بۆ ئەوەی ڕزگارین ببێت.

٣. چەمی حاجی لە سەرەوەی گەڕەکی کەلاری کۆن.

ئەم چەمە دەروازەیەکی گرنگ بوو کە گوند نشینەکان بەشەواندا لەم چەمەوە دەهاتنە نێو شاری کەلار، چونکە نزیک بوو لە گوندی سەیدخەلیل و گوندی نازێ، ئەمەش وای کرد بە ئاسانی زۆرێک لە و خەڵ کە ڕزگاریان بوو خۆیان بگەیەننە شاری کەلار.





# شاری کەلار / ناوەندی گەرمیان
# لە گەڕەکێکەوە بۆ شارێك

ئیبراهیم کوێخا زەند



شارەکان لە شوێنێکی بچووکەوە دروستبوون و بووە بە دێ و شارەدێ و شاری گەورە .ئاوەدان کردنەوە و فراوانبوونی شوێنەکان پەیوەستە بە دەسەڵاتەوە . دەسەڵاتەکان و بگرە و بەردە و هاتن و چوونی دەسەڵات یا حکومەت کاریگەری بەرەو پێشچوونی لادێ و شارەکانی هەبووە لەلایەنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوری و ئاینی و شوێنەواری ....هتد .

لە کۆنەوە خەڵکی کۆچ دەکەن لە شوێنیکەوە بۆ شوێنێکی تر و بە تایبەت بۆ شارەکان ئەو کۆچ و گواستنەوانە لە ئەنجامی گۆرانکاری ئاسایی ناو کۆمەڵگا هاتۆتە پێش و ئاسەواری سلبی لێنەکەوتۆتەوە گواستنەوەکە وردە وردە و لەسەخۆ ڕویداوە بەڵام ئەو کۆچە فراوانەی کە بۆ کەلار هاتووە لە ساڵی ١٩٧٥ ەوە تا ئەمرۆش بەردەوامی هەیە کە لە پاش هەرەسی شۆرشی ئەیلولەوە بە بەرنامەیەکی تۆکمە و بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی و توندوتیژی وێرانکردنی دێهاتەکان و ڕاگواستنی دانیشتوان دەستیپێکرووە تاوەکو ئێستا بە قۆناتغی جیا جیا کە باسی لێوە دەکەین .

کەلار شارێکی تەمەن درێژ نەبووە کە نزیکەی ٥٠ ساڵ کەمتر تەمەنی بووە بەهۆی گۆرانکاری بە تایبەتی سیاسی هەروەها کۆمەڵایەتی و ئابووری کاریگەری دروستبوون و فراوانبوونی کەلار هەبووە .

شوێنی جوگرافیای کەلار لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕووباری سیروان و دەشتی بنکورە لە ڕۆژئاواوە کفری و سەرقەڵا لەباکوورەوە ناحیەی باوەنوور و دەشتی پێواز لە باشوورەوە دێهاتەکانی زەنگاوات (کولەجۆ و کۆکس) . پانتاییەکی فراوان و ڕوبەرێکی دەشتایی هەیە .

وە شوێنەواری گرنگی (قەڵای شێروانە ) کەوتۆتە دەروازەی شارەوە .

ڕووباری سیروان بە درێژای کەلار بەرەو خوار دەبێتەوە بە پردێ کەلار و دەشتی بنکورە و خانەقین دەبەستێتەوە بە یەک . سەرەتایی حەفتاکان کرا بە ناوەندێکی بچووکی سەربازی و ئەمنی بۆ دەستبەسەرکردنی ناوچەکە , وەزعە سیاسیەکەشی یارمەتی دەربوو بۆ پێشکەوتنی هەروەها شوێنی جوگرافیای کەلار وا هەڵکەوتووە کە نزیکە لە ناوەندە سیاسیەکان و ئابووریەکانی عێراق و کوردستان کە ( بغدا, کەرکوک, سلێمانی , ئێرانە ) .

سەبارەت بە ناوی کەلار مامۆستا جەمال بابان چەند بۆچونێکی خستۆتە ڕوو لەوانە :

١-کەلار لە( کەلا_ڕێ) وە هاتووە واتا گوندێکی دوورە دەست چونکە لە کۆندا ئەو ڕێگاو بانەی ئێستای نەبوو .

٢- (کەڵ_یار ) وتا شوێنی ئاسک .

٣- (کەلات)لە بنەڕەتدا گۆراوە بە کەلار یان کەلاوە بووە چونکە پێش ئاوەدان کرنەوە کەلاوە بووە .

هەرچەندە بە شێروانەش بەناوبانگە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ قەڵای شێروانە و گردەکەی .

لێرەدا پێویستە باس لە هەموو بوارەکانی کەلار بکەین چ وەک بواری پەروەردە و خوێندن , کۆمەڵایەتی , ئاینی , سیاسی , شوێنەواری , ژینگە و جوگرافیا و کەلتورو دابوونەریت .

بە پێویستم زانی بە کورتی قۆناغەکانی ئاوەدانکرنەوەی کەلار و ڕەخساندنی هەلیگونجاو بخەمەڕوو , کە وەک خویندکار, مامۆستا , ئاوارە دانیشتووی کەلار تیایا ژیاووم و قۆناغەکانم بینیووە .

کەلار پێکهاتەیەکی کوردەواری شارستانیە دانیشتوانی بە گشتی کوردە مەزهەبی جیاجیای تیایە کە (شافعی ,حەنەفی , کاکەیی..... هتد )

وە ناوەندی گەرمیانە ناوچەیەکی کشتوکاڵی , پیشەسازی , بازرگانی یە .

وە گرنگی بە پاریزگاربوونی مەرجەکانی پارێگای تێدایە بە هۆی فراوانی و بەربڵاوی ڕووبەرەکەی .

وه لـەسـەرەتـای دروسـتـبـوونـی چـەنـد خـانـوویـەک بـۆ فـەرمـانـبـەران و چـەنـد دەزگـای حکومی بـۆ قـەزاکـە دروسـتکرا (نەخۆشخانە , قوتابخانە , شـارەوانی , کشتوکاڵ , کارەبا .... هتد) وردە وردە ژمـارەی دانیشتوانی لە زیادبوون بوو تاوەکو ساڵی ١٩٧٥ وە لێرەدا بە چەند قۆناغێک فراوانبوون و ئاوەدان کرنەوەی کەلار باسی لێوە دەکەین :

## کـەلار

١- بە مەرسوم ی جمهوری ٣٠ ژمارە ١٣٧ بە ئیمزای سـەرۆک کۆماری عێراق (احمد حسن البكر ) کرا بە قەزا .

٢- مەرسوم ی جمهوری ٥٥ ژمارە ٦٠٦ لە ٦-١١-١٩٧٥ ناحیەیەکی تازە بە ناوی (تیلەکۆ ) دروستکرا بەمەش کەلار بو بە خاوەنی دوو ناحیە ( تیلەکۆ و پێباز ).

٣- بـە مـەرسـوم ی جـمـهـوری ٥٦ ژمـارە٦٠٧ لـە ٦-١١-١٩٧٥ سـەرقـەڵا (ناحیەی شێروانە ) لە کەلار دابڕا و خرایە سەر کفری.

٤- مەرسوم ی جمهوری ٥٧ ژمارە ٦٠٨ لە ٦-١١-١٩٧٥ کەلار و چەمچەماڵ لە کەرکوک دابڕا و خرایە سەر سلێمانی کفری لە کەرکوک دابڕا و خرایە سەر دیالی.

٥- وه لـە بـەهـاری سـاڵـی ١٩٨٧ پـاش ڕووخـانـدنـی دێـهـاتـەکـانـی گـەرمیان ئۆردوگـای صمود دروسـتکرا و خرایە سەر کەلار .

## قۆناغی یەکەم :

لـە سـاڵـی ١٩٧٥ کـە دێـهـاتـەکـانـی کوردنشـیـنـی قـەزای خـانـەقـین (ئـەوبـەر ڕووبـاری سـیـروان و بـنـاری بـەمـۆ ) ڕووخێنرا و دانیشتوانەکانیان ڕەوانـەی کەلار کران ئەوەش بە دروستکردنی چەند کۆمەڵگایەک دروستکرا وەک ٥٠٠ ماڵەکە ( شۆرش ) ،کۆمەڵگەکانی: حمەی کەریم ، گازینو ، بەردەسور و دیهاتەکانی ئەوبەر سیروان کە ڕاگوێزرانەوە هینران بۆ ئەم کۆمەڵگایانە بەمە کەلار ١٠٠ ٪ کاریگەری نفوز کار ژمارەی دانیشتوانی زیادی کرد ئەمەش وایکرد کەلار بەرەو پێشکەوتنێکی بەرچاو بروات.

## قۆناغی دووەم:

دوای کـەمتر لـە ٥ سـاڵ شـەری عـێراق ایران لە نێوان هەردوو وڵات ڕویدا ڕژیم زۆربـەی گـەنـجـانـی ڕاپـێـچـی سـەربـازی دەکرد شار و دێهاتە سنورییەکان بەر تۆپ بارانی هەردوولا دەکەوتن ئەمەش وایکرد بۆ جاری دووەم کەلار پێشکەوتنی بەرچاو بە خۆیەوە ببینێ لە دانیشتووانی ناوچە سنورییەکان کە ڕویان دەکردە کەلار و نیشتـەجێ بـوون هـەروەهـا سـەربـازی هەڵهاتوو لە کـەلار دەگیرسانەوە کار و کاسبی لە ناوچەکە ڕو لە زیاد بوون بوو .

## قوناغی سێیەم:

کە گفتووگۆ لە نێوان ڕژێمی عیراق وسەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٨٤ دەستپێکرد و بەمەش ژمارەیەک لە کوردەکانی خواروو ناوەڕاست ڕوویاندەکردە کەلار و جێگیر دەبوون ئەمەش کاریگەری بەرچاوی بە خۆیەوە بینی تاکو ساڵی ١٩٨٧.

## قۆناغی چوارەم:

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧ حکومەتی بڕیاریدا سەرجەم دێهاتەکانی کوردستان بڕوخێنێت دانیشتوانەکانی لە ئۆردوگا زۆرەملێکانی دروستیان دەکرد لە گەرمیانیش ئۆردوگای (صمود) ڕزگاری ئێستا هەموو دانیشتوانی گەرمیانی کۆ کردەوە بەمەش خەڵکی زۆر لە کەلار نیشتەجێ بوون چونکە نەچوونە صمود لەبەر ئەوەی هیچ خزمەتگوزارییەکی نەبوو تەنها خەڵکەکە خانووی بە بلۆک و دار دەکرد هەنوکە بۆ ژیانی ئاسای خۆی تا وایلێهات بازاری کەلار بوو بە یەکێ لەو بازارانەی کە شتومەک و کاڵاکانیان ساغ بکەنەوە .

وە ساڵی دواتر ١٩٨٨ شاڵاوی ئەنفال دەستپێکرد ئەمەش کاریگەریەکی ئەوتۆی هەبوو لە چڕ بوونەوەی دانیشتواندا .

## قۆناغی پێنجەم:

لە ساڵی ١٩٩٠ لە ٢ی مانگی أب داگیرکردنی کوەیت و هەڕەشەکردنی ئەمریکا بۆ لێدانی عێراق کە هەندێ لە دانیشتوانی پارێزگاکانی خواروو و ناوەڕاستی عێراق ڕوویان کردە کەلار .

تاوەکو بەهاری ١٩٩١ ڕاپەرینە مەزنەکەی کوردستان دەستپێکرد ئەمەش بوو بە تێکچوونی باری دەروونی دانیشتوانی عێراق بە گشتی و کوردستان و کەلار بە تایبەت . هاتووچۆ پەیدابوو لە بارکرن و گەڕانەوە بۆ شوێنی ڕەسەنی خۆیان کە دەرچوون لێی تاوای لێهات بە لێشاو گەڕانەوە بۆ کەلار . شەڕی ناوخۆ کاریگەری هەبوو لە ١٩٩٦ و تاکو ڕووخانی ڕژێم بەردەوام لە گەشەدا بوو لە هەر قۆناغێک بە جۆرێک کاریگەری هەبوو بە شێوازی جیاجیا سست و بەهێز کاریگەریان هەبوو .

لە ڕووخانی ڕژێم ٢٠٠٣ ئەمەش وای کرد ببێتە ناوچەیەکی ستراتیجی چونکە ڕێگەی بەغداد_کەلار ، کەرکوک_کەلار سلێمانی_کەلار ، سنوری ئێران_کەلار بە یەکەوە دەبەستێتەوە .

**وە قۆناغی شەشەم :**
هاتنی ئیدارەی گەرمیان کە پارێزگای کەرکوک بوو لە دەربەندیخان و گەڕانەوەی کارگێری دەزگاکان بۆ کەلار زۆری فەرمانبەرانی دەزگا حکومیەکان و دروستبوونی زانکۆی گەرمیان و پەیمانگاکان کە ناوەندێکی رۆشنبیری بەهێز بوون بە هاتنی خوێندکارانی پارێزگاکانی تری کوردستان بۆ کەلار مانەوەی خوێندکاران کاریگەری بەرچاو و فراوانبوونی ڕووبەری نیشتەجێبوون و زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی بوو .
لێرەدا پێویستە چارەسەرێکی حەکیمانەی پێویست بۆ بە پارێزگابوونی بکرێت کارنەکاتە سەر کەرکوک چونکە بە دابڕانی کەلار و کفری و خورماتوو ڕێژەی کورد لە کەرکوک کەمدەبێتەوە ئەمەش دەبێتە خاڵێکی ئەرینی گرنگ بۆ نەیارانی کورد لە کەرکوک .
چونکە کەلار شوێنی پێکەوە ژیان و کار و بژێوی ناوچەکەیە و وە دانیشتوانەکەشی ئێستا کورد و ڕێژەیەکی عەرەب و هیترن .

## ئامارێکی ڕێژەی گەشەسەندنی شاری کەلار :

١-دانیشتوانی شاری کەلار نزیکەی ٢٠٠,٠٠٠ کەس زیاترە.
٢-ڕووبەری گەرمیان ٢١٪ ی هەرێمی کوردستانە .
٣- ژمارەی قوتابخانەکانی شاری کەلار ٥٧ قوتابخانەی بنەڕەتی و ٢٠ قوتابخانەی ئامادەیی تێدایە .
٤- ٣٤ مزگەوتی ئاینی لەناو شاردایە .
٥-٥٠ هەزار زیاتر دۆنم زەوی کشتوکالچی هەیە .
٦-٣ مەرزی نێودەوڵەتی لە سنورەکەدایە .
٧-زیاتر لە ١١٠ کارگەی جۆراو جۆری هەیە .
٨- سەوزایی لە ئاستێکی باشدایە .
شارەوانیەکانی کەلار لە ئاستی چوارەمی شارەوانیەکانی هەرێمی کوردستاندایە .
ئەمە کورتەیەک بوو تەنها لە بواری فراوانبوون و ئاوەدانی کەلار .



# کەلار کەی دەبێتە شار ؟!

بێستون ژاڵەیی

ئێستا تەمەنی کەلار وەک ئاوەدانیەک لەدوای بڕیاری کردنیەوە بە قەزا لەناو مەنزومەی ئیداری حەفتاکانی سەدەی ڕابردووی دەوڵەتی عیراقدا خەریکە دەبێتە نیوسەدە ، جا بۆ ئێمەی کەلاریەکان مادام قەدەرمان ئەوەیە کە کوڕ وکچی ئێرەین و کەلار شوێنی ژیان وشاری ناو یادەوەریەکانمانە ، کەواتە وەزیفەی جۆراوجۆری ئەخلاقی وکۆمەڵایەتی وژیاریمان بەرامبەر ئەم ئاوەدانیە هەیە کە لەباوەشیدا ئارام هەڵی گرتوین وخۆشی ژیان ئەنۆشین .یەکێک لەبەرپرسیاریتی و ئەرکە گرنگەکانی ئێمە هەموومان لەبەرامبەر ئێرەدا بیرکردنەوەیە لە ئایندەی ئەم شوێنە ، باشە هەر بەجدی لایەنە تایبەتمەند وپەیوەندیدارەکانی ئەم شارە هەرگیز بیریان لە ئایندەی ئەم شارە کردۆتەوە ؟ یا ڕوئیایەکیان بۆ ١٠ ساڵی داهاتووی کەلار هەیە؟ئایا هیچ لایەک پلان وپرۆژەیەکی بۆ ١٠ یا ١٥ یا ٢٥ ساڵی تری شارەکە هەیە؟! ئەگەر بەڵێ، کامەیە؟ لای کێیە و وردەکاریەکەی چۆنە؟ ئەگەر نا، ئەوە کارەساتێکی گەورەیە وپێویستی بە لەسەر وەستان و کار بۆ کردنە، چونکە هیچ گەشەکردن و بوژانەوەیەک بێ پلان وپرۆژەی ئایندەیی بوونی نیە و ڕوو نادا ، ئێستا لە جیهاندا زۆر ناوەندی گرنگی توێژینەوە هەن کە ساڵانە ڕاپۆرتی ڕیزبەندی شارە گەشەکردووەکانی دنیا دەخەنە ڕوو ، لەوانە

ئاژانسی کیرنی بۆ ڕاوێژی بەڕێوەبردنی نێودەوڵەتی a.t.kearney کە بۆ ڕاپۆرتی ساڵی ڕابردووی ڕوپێوی ١٣٥ گەورەشاری لە شەش ناوچەی گەورەی دنیادا کردووە ،نیویۆرک و لەندەن و پاریس پێگەی خۆیان بەدوای یەکدا لە لوتکەی ئەم ڕیزبەندیەدا پاراستووە و هەر تەنیا لە ساڵی ڕابردوشدا ٥ شاری چین ڕۆشتوونەتە سەر نەخشەی شارەجیهانیەکان، بەڵام بۆ خۆمان ڕاستیە تاڵەکە ئەوەیە کە نەک کەلار بەڵکو شارە گەورەکانی کوردستانیش شوێنیان لەسەر ئەو نەخشەیەی شارە جیهانیەکان نیە.

بۆ ئەوەی بزانین ئێستا کەلار دەکرێ پێی بووترێ شار یان هەر ئاوەدانیەکی گەورە و هەپڵۆکینە، ئەوە دەبێ لە زۆر ڕووەوە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەین ، جارێ دەبێ بزانین شاری گەشەکردوو شارێکە لە دیزاینیدا کاریگەریە ژینگەییەکان ڕەچاو دەکرێ، وەک نمونە ئایا لە دیزاینی کەلار وفراوان کردنیدا تا چەند حیساب بۆ گەرمای توندی ئەم دەشتە و گرە وگەردەلول وخۆڵبارین کراوە؟ یان لە ئێستە بەدواوە کە شارەکە کەوتۆتە سەر هێڵی بومەلەرزە پێویستە چۆن مامەڵە لەگەڵ دیزاینی بینا وباڵەخانەکاندا بکرێ .

لەشاری گەشەکردودا خەڵکیش بەرپرسیارێتیان هەیە و ڕەفتاری مەدەنیانەیان گرنگ و چارەنووسسازە، دەبێ ئابوریانە پێداویستیە دابینکراوەکانی وەک وزە وئاو و خۆراک بەکاربێنێ و کەمیان کاتەوە ،لەبەرامبەریشدا فەزڵە و دەرچووە زیانبەخشەکانی وەک گازی ژەهراوی و مادە پیسبووە بەکارهاتووەکان کەم بکاتەوە وریساکلینیان کات .

پێویستە بۆ گەشەپێدانی کەلار و دانانی لەسەر نەخشەی شارەجیهانیەکاندا لە ئێستای کەلار تێ بگەین، چونکە شار بە ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و ئابووری دەناسرێ ، زۆر جار قسە لە سەوزکردنی کەلار دەکرێ ،بەڵام سەوزکردن هەرچاندنی نەمامێک نیە بۆ وێنەگرتنی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و دواتریش لێنەپرسینەوەی وبەخێونەکردنی! بەڵکو شاری سەوز واتە شارێک چارەسەری بۆ گازە ژەهراوییەکان هەیە و زبڵ وخاشاکەکەی دەکاتە دۆستی ژینگە ، شاری جوان شارێکە سروشتی جوانە و پارک و شوێنە گشتیەکانی لە باخ ومەزرەعەی بەرپرس و دەوڵەمەندەکانی جوانترە، داون تاون ومەیدانەکەی دڵڕفێن و زیندوو وپڕجموجوڵە، شاری جوان بۆ گەشتیار پڕە لە بەرهەم وبەروبومی خۆماڵی سەرنج ڕاکێش ، شاری گەشەکردوو شانازی گەورە ئەداتە خەڵکەکەی وخۆشگوزەرانیان لەچاویدا دەبینن و تیایدا هەست بەجوانی مادی ومەعنەوی شوێن ئەکەن ،شاری گەشەکردوو ئیدارەی باش وئیدارەدانی پەرۆش وفراوان ومیهرەبانی تێدایە

،لەشاری گەشەکردوودا دامەزراوەکان بەتەریبی کاری خۆیان دەکەن ، ماڵەکانی عیبادەت ئارام وبەشکۆن وکەس دەست لەکاروباریان وەرنادات ، سەنتەرەکەلتوری وگەنجانەکان خزمەتی پێویستیە گرنگەکانی چین وتوێژەکانی شارەکە دەکەن ، مەعریفە و خوێندن و توێژینەوە وزانکۆ پایەکانی شارەکەن ، میدیا تیایدا هاوشاریان تەشویق ئەکا بۆ ڕێزگرتنی بەهاکانی پاراستنی شارەکە ، شاری گەشەکردوو شارێکی زیرەک ودیجیتاڵیە و ئیدارەیەکی ژیر وبەڕێوەبردنێکی ئەلیکترۆنی هەیە و هەموو کەس بە ئاسانی تیایدا دەستی دەگاتە هەموو زانیاریەکانی پەیوەندیدار بەژیان وگوزەرانیەوە ، هەروەک هۆکارەکانی حەوانەوەی ئەلیکترۆنی بۆ خەڵکەکەی فەراهەم دەکات ، لە خزمەتگوزاری بانکی ئەلیکترۆنی و بازاڕگەری ئەلیکترۆنی ، ئێستا ئیتر پێویست ناکا هەر لە قۆناغی بۆڵە بۆڵدا بین و وەک مۆدێلە کوردیە نەزۆکەکە هەر خەریکی هات وهاوار وقیژە قیژ بین ، لەجیاتی ئەو خووە خراپ و بێ ئەنجامە دەبێ بپرسین کەلار لەکوێی ئەم تایبەتمەندیانەی شارێکی جیهانیدایە ؟ ئەنجا چۆنیش لەو پێگەیەی ئێستایەوە بیگەیەنینە ئەم ئاستانەیەی شارەجیهانیەکان ؟! بێگومان بۆ ئەمە شۆککبوون و ڕامان وئەنجا ڕاچەنینی زەینی دەستە جەمعی و دواتریش خەون وخەیاڵی فراوان و ئیرادەی ئاسنین وپلان وپرۆژە و ئیشی بەردەوامی شەو ورۆژیمان دەوێ .

پرسیارێکی تر بۆ ئێرە ئەوەیە کەلار لە ئەدای شارستانیانەی شاردا چ پێگەیەکی هەیە ؟ ئەمە پێوەری خۆی هەیە بۆ وەڵامدانەوە ، کە چالاکیە بازرگانیەکان یەکێک لە کۆڵەکەکانیەتی و لەم بوارەشدا کەلار هەم بە سەرمایە مرۆییەکەی و هەم بە هەڵکەوتە جواگرافیەکەشی و بوونی نەوت ومەرزی نێودەوڵەتی و ڕوبار وکێڵگەی کشتوکاڵی بەپیت و هەل ودەستی کار چانسی باشی هەیە ، بەڵام ئەم پێگە ئابوریەی کەلار نایکاتە شارێکی زیرەک وئایندەدار بەبێ بڕیاردانی شەفاف ودیموکراسی وبەشداری پێکردنی هەمووان و پەراوێز نەخستن ، دەبێ هەلی یەکسانی جاڕو بەکرێدان هەبێ ،کێبەرکێی شەریفانە وفرسەتی یەکسان هەبێ ،دەبێ ئازادی نیشتەجێبوون ومولککڕین فەراهەم بێ ،ڕەفتاری کۆمەلایەتی لە شوێنەگشتیەکان بەرز وڕێزدارانە بێ ، هۆکارەکانی گواستنەوەی گشتی لەشاردا فەراهەم وپڕ تەکنیک بن ،شوێنەکانی حەوانەوە وچێژبردنی گشتی پاک وپڕخزمەتگوزاری وسەرنج ڕاکێش بن ، سیستەمی ژیانی گشتی ڕێکخراو و خزمەتگوزاریە گشتیەکان هەمیشە فەراهەم و ژێرخانی شار ئاوەدان وژینگە سروشتیەکەشی پاک ودیدەنی بێ ، دەبێ

هەوڵی دەنگەزیندووەکان وچین وتوێژە کاریگەرە لۆکاڵەکان لێرە بۆ ئەوە بێ ڕەفتارەی حکومەتی خۆجێی کەلار وگەرمیان بگۆڕن بۆ باشتر ،چونکە بۆ گەشەکردنی شار ئێجگار گرنگە کە ئیدارەی بچوکی تۆکمە و هەماهەنگ لەناو خۆیدا وەک یەک تیمی ڕجولەی پێکەوە گرێدراو کاربکات و خەمی گەورەی دەسگەیشتنی هەموو هاوشاریان بێت بەخزمەتگوزاریە گشتی وکۆمەڵایەتیەکان .

بۆ گەیشتن بە ئاستانەی شارەجیهانییەکان کەلار پێویستی بەوەیە خەڵکەکەی ئیمتیازی جیاواز وئابوری جیاواز و حوکمی ڕەشید و ژینگەی داهێنەرانەیان هەبێت ،کەلار پێویستی بەتوانای جێکردنەوە وبەگەڕخستنی تواناکان و لەخۆگرتنی گەورە کۆمپانیاکان و بەهرە ولێهاتووییە جیهانییەکانە ، هەموو ئەمانەش پێویستیان بە پەیدا کردن و قووڵ و فراوان کردنە ، پێویستە دەرگای دزی ودەست تێکەڵکردنی نامەشروع لەگەڵ بازرگانان وبازرگانی لە بەرپرسانی سیاسی وئیداری دابخرێ ، پێویستە ئەو حیکمەتە سەقەتە لەکار بخرێ کە هەر خاوەن سەرمایە وخاوەن پیشە وبەهرەیەک هەڵکەوت ئیتر لێرە جێی نابێتەوە و ئێرە بۆ خەون وپرۆژەکانی بچووک دەبێت ، دەبێت ئەو هەزاران کەناڵەی کار وداهێنان وپرۆژە بکرێنەوە ، کە لێرە سیاسەتی سەقەت و گەمژەیی سیاسی وخێڵەکی وجەهل دایخستوون .

خێراترین شارەکانی دنیا لەگەشەکردندا ئەوانەن کەلەهەموو ڕویەکەوە پڕن لە دڵنیایی و خاڵین لە مافیای بازرگانی و داخرانی سیاسی وکەلتوری وئابوری ، کارەساتە کە ناوبانگی کەلار پێچراوەتە ئەو کوڵە سوچە تەنگەی کە لێرە وەبەرهێنان بێ شەریکی لەگەڵ بەرپرسە دز و دەخەڵەکان ناکرێ !لەئێستە بەدواوە کاتێک گوێمان لە زاراوەی «شارۆچکەی کەلار»دەبێت لە جیاتی تورەیی وکرژبوون ڕاستتر کار لەسەر ئاگایی و بیرکردنەوە و ڕەفتاری گشتیمان بکەین بەرە وئامانجی هەڵگرتن وبەرزکردنەوەی کەلار بۆ سەر نەخشەی شارە جیهانیەکان .



# کەلار، وەکوشاری ئاو، وەکو چەقی بوژانەوە!

## - سەرەقەڵەم بۆ ماستەرپلانێکی فرەبوار

ڕەحمان خانی

کەلار لە قەڵایەک و دێیەکەوە، بو بە ناوەندی قەزا و دواتریش ئیدارەیەکی سەربەخۆو وا بەرەو پارێزگا ،گەشەدەکات . دەبێ شوێنی جوگرافی ئەم شارە فاکتەری بەهێزی گەشەکردنی بێت ؛ کە ناوەندی دەڤەرێکی فراوان، چەقەڕێ وکاروانسەراو چەقی پلّەس لە نێوان هێڵی هەڵەبجە ، سلێمانی و بەغداد بە دیالەدا لە لایەک و هەروەها کرماشان ، سەرپێڵ ،قەسری شیرین و مەرزی پەروێزخانی سنوربڕو لەملاشەوە کەرکوک بە دوزو کفری دا لە لاکەی تر. بەمەش عێراق وئێران بە هەرێمەوە گرێ دەدات ، هاوکات روباری سیروان کە داهاتی ئاوی ساڵانەی لە ٥٠ ساڵی رابردودا وەکو تێکڕا ( ٥ ) ملیارمەتر سێجابوە ، بۆ ئێستاو ئایندەش؛ کەلاری پێ بەهێزتر دەبێ و دەیکاتە ناوەندی چڕیی دانیشتوان و بوژانەوەی کشتوکاڵ و پیشەسازی و ژێرخانی ئابوری تۆکمە ،(ئەمە لەکاتێکدایە تەواوی شانشینی ئوردن کە دانیشتوانی نزیکەی ١٠ ملیۆن کەسە ، ساڵانە بە تێکڕا تەنها ٨٠٠ملیۆن م٣ ئاوی سەرزەوی هەیە) . چونکە بەداخەوە تەواوی شارەگەورەکانی کوردستان لە سەرسەرچاوەی ئاو دروست نەکراون ، پشتیان بە چەمی وەرزی وکانی و کارێزو بیر بەستوە ، ئێستا (سلێمانی و کەرکوک...)کێشەی کەمئاوییان هەیەولە زێی بچوکەوە ئاویان بۆ راکێشراوە و هەولێر لە زێ ی گەورەوە و دهۆک -یش ئەو بەنداوەی هەیەتی بەشی

٣٠٪ی ئاوی خواردنەوەی شارەکە ناکات و لە بەنداوی موصلەوە ئاوی بۆ دەهێنرێت ،جیاواز لە تەواوی پارێزگاکانی عێراق کە یا لە سەر دیجلەو فورات ، یان لقە سەرەکیەکانیان ئەو شارانە بنیات نراون ، بیرمان نەچێ تەواوی شارستانیەتە دێرینەکانی دنیا لە سەر سەرچاوەکانی ئاو دروست کراون ، قەڵای شێروانەو گاورجۆگە و شوێنەوارە دێرینەکانی تر لەسەررووباری سیروان ئەوە ساغدەکەنەوە ، کوردیش دەمێکە لە رێ ی پەندی (ئاوو ئاوەدانی) ئەو راستیەی سەلماندوە .کاتی خۆی لە پلانی دروست کردنی بەنداوەکان لە کوردستان، پێداگریمان لە پرۆژەی بەنداوی بەردەسور ، لەو سۆنگەیەوە بو کە ئەو بەنداوە بایەخێکی زۆری بۆ فراوانبون و گەشەکردنی کەلار وخانەقین و دەوروبەری دەبێت،لەکاتی پێویستدا تەوژمی لافاو کەم دەکاتەوە، سەرجەم بوارەکان دەبوژێنێتەوەو کەش وهەوای شارخۆش دەکات و دەبێتە گەشتیاری ، ئەوە بو دیزاینی ئەو بەنداوە کە ٢٨ م بەرزەو تواناى خەزنی (١٦٨) ملیۆن مەتر سێجایە؛ تەواو کراو ئامادەیە، بەداخەوە لە کاتی پارەبرانەکەی هەرێم، دیزاینەکە پێگەیی و نەتوانرا دەستی پێبکرێت ، ئەم برە ئاوەش هەردوبەری سیروانی پێ پاراو دەکرێت و وەکو بەنداوێکی رێکخستن و کۆنترۆڵی خەزنی ئاو بۆ بەنداوی دەربەندیخان بەکار دەهێنرێت و بەردەوام ئاوی لێ نابرێت،ناهێڵێ لە هیچ حاڵەتێکدا کەلارودەوروبەری بێ ئاو بێت.جگە لەوەش ئاوی ژێر زەوی بە جۆرێک دەبوژێنێتەوە ، کە خزمەتێکی زۆر بەو هەمو باخ و بەراوە بکات کە پشتیان بەم ئاوە بەستوە ، دەکرێ وەکو پردی پەڕینەوەش بەنداوەکە بەکار بهێنرێت.بۆیە پێویستە ماستەرپلانێکی گشگیر بۆ بوژاندنەوەو فراوانکردنی کەلار و دەوروبەری لە لایەن کەسانی شارەزاوە دابنرێت ، بودجەو میکانیزمی جێبەجێ کردنی پۆلێن وقۆناغبەند بکرێت لەم بوارانەی خوارەوە کە وەکو سەرەقەڵەم دەیخەمە رو، بۆ گفتوگۆو دەوڵەمەند کردن لە لایەن شارەزایانەوە:

- بودجەی پێویست بۆ ئەو بەنداوە دابین بکرێت و دەستی پێ بکرێت ، چونکە دیزاینەکەی ئامادەیە، دەکرێ لە رێی حکومەتی عێراقەوە کاری بۆ بکرێت چونکە بۆ کەمکردنەوەی تەوژمی لافاوو پرۆژەکانی ئاودێری ناوچەکانی خوارویش گرنگە.
- هاوکات پرۆژەی ئاودێری تایبەت بەو بەنداوە بخرێتە بەرنامەی جێبەجێکردنەوە .
- کەلار پێویستە بپەڕێتەوە ئەو بەری سیروان بە دروستکردنی چەند پردێک.
- بواری گەشتیاری بە رێکخستنی چەمی سیروان، راڕەوی ئاو بەشێوەیەکی ئەندازەیی وزانستی،بەردپۆشکردنی هەردوکەنارەکە و دروستکردنی کۆڕنیش و پرۆژەی گەشتیاری وجوانکردن ،لابردن و قەدەغەکردنی گشت جۆرە کارگەیەکی چەوولم وبلوک و....بە درێژایی کەلار،

دروستکردنی شەقامی پان وپۆڕ لە بەردەسور(بەنداوەکەوە) تا دەگاتە پردی گردەگۆزینە لەمبەرو لەو بەری کەناری سیروان، دەستوالاکردنی پرۆژەی گەشتیاری و پارک و هوتێل و ریستورانت ویاریگەو ... لە هەردو بەر.هەڵمەتی نەمام چاندن بە شێوەیەکی زانستی ، جێ بەجێ بکرێت.

• ڕێگاوبان شادەماری بوژاندنەوەیە لە گشت بوارەکاندا؛ پیشەسازی،بازرگانی،کشتوکاڵ وگەشتیاری.....تد.لەڕێی نوێنەرانی کوردوناچەکە لە بەغدا کاربۆ دوساید کردنی ڕێگای کەلار بەعقوبەو لەوێشەوە بەغداد بکرێت،لەملاشەوە کەلار کەرکوک ،پەلە لە پرۆژە دوسایدەکەی کەلار سلێمانی بکرێت، هەتا سنور بکرێت بە جادەی خێرا. ئەمە کەلار دەکاتەوە بەو چەقی پلەسە لە گەشەسەندن.

• ئەو سەرچاوە سروشتیانەی کە لە ناوچەکە هەن ، لە کێڵگە وەبەرهێنەکانی نەوت وغاز وکانزاکانی تر،ڕێکبخرێنەوەو بخرێنە خزمەتی خەڵکەکەوەو هەوڵ بدرێت پترۆدۆلار بۆ گەرمیان مسۆگەر بکرێت و ژێرخانی ئابوری دەڤەرەکەی پێ بەهێز بکرێت، رێگری لە پیسبونی ژینگەکەی بکرێت.

• لە ئێستاوە لە ڕێی سەتەلایت ئیمەیج و دەزگاکانی روپێویەوە زەوی بەرین و گونجاو بۆ دروستکردنی فرۆکەخانەیەکی مەدەنی تەرخان بکرێت با دوربێت لە کەلاریشەوەو لانی کەم نەهێڵرێت هیچ مونشەئاتێکی جێگیری تێدا دابنرێت ، جگە لە کێڵانی کشتوکاڵی،بۆ ئەوەی لە هەر دەرفەتێکدا شوێنت هەبێ بۆ فرۆکەخانە.

• گرنگی بە سێکتەری کارەبا بدرێت و پرۆژەی دروستکردنی وێستگەیەکی بەرهەمهێنانی کارەبا ی غازی، پەلەی لێ بکرێت کە لە ٢٠٠٩ ەوە زەوی بۆ وەرگیراوە، بە پشتبەستن بە غازی سروشتی ناوچەکە (کوردەمیر)و شوێنانی تر ،کە یەکێکە لە پرۆژە گرنگەکان بۆ گەرمیان.

• خوێندنی باڵاو پەروەردە گرنگی زیاتری پێ بدرێت و زانکۆی گەرمیان پێویستیەکانی لە مامۆستا و تاقیگەو ئامێری فێرکردنی پێشکەوتو بۆ دابین بکرێت و هەوڵبدرێت لە تواناسازی بەشی ئەم ناوچەیە دابڕێنرێت، لەروی توێژینەوەو بەشداری لە پێشخستنی ناوچەکە گورج بکرێتەوە، رۆحی پێشبڕکێی لەگەڵ زانکۆکانی تر تێدا بروێنرێت، هاوکات پەیمانگاکان ئەو بوارانەیان تێدا پەرە پێ بدرێت کە پێویستن و سێکتەری پەروەردەوخوێندنگەکانیش کە بەردی بناغەن ببوژێنرێنەوە.

• بواری تەندروستی زیاتر پەرەی پێ بدرێت ،خەستەخانە ١٠٠ قەرەوێڵەکە تەواو بکرێت و خەستەخانەیەکی لانی کەم ٢٠٠ قەرەوێڵەیی تر بخرێتە پلانی جێبەجێ کردنەوە بە تەواوی ئامێرو کەرەستەو پزیشکی پسپۆرو شوێنی نیشتەجێی پزیشکەوە، هەمو پسپۆریەکان بگرێتەخۆی،

بۆ ئەوەی لە ئاست پێویستیەکانی ناوچەکەدا بێت.

• بواری کشتوکاڵی زیاتر ڕێکبخرێتەوە و توێژینەوەی زانستی لە بوارو گونجاوی خاک و ئاوی ناوچەکە پشتی پێ ببەسترێت، بازبەسەر بەروبومی کلاسیکی و کەمبازاڕدا بدرێت ، دەکرێت لەم بوارەدا پرۆژەکانی کشتوکاڵ بە دانانی سەرپەرشتیاری ئەندازیارانی کشتوکاڵ پەرەی پێ بدرێت وزانکۆش ڕۆڵی خۆی بگێرێت،دەتوانرێت دەیان کێڵگەی وەبەرهێن بە پرۆژەی هاوبەش لە نێوان وەبەرهێن وخاوەن زەویدا ڕێکبخرێت، دروستکردنی سایلۆو عەمبارکردنی دانەوێڵە و بەروبومە کشتوکاڵیەکان ، بازاڕسازکردن بۆیان.

• دەستی وەبەرهێنان لە بواری پیشەسازی وکشتوکاڵ ونیشتەجێبون بکرێتەوە ،کە بونی ئاو پێکهێنەری سەرەکیە لە م بوارانەدا ؛ وەکو کارگەی قیر ، خشتی سورەوەکراو،کارگەی شیرەمەنی ، ئاوی کانزایی، کارگەی لە قوتونانی دۆشاوەکان،خواردنەوەغازی و ئاوی میوەکان ، کارگەی زەیتی زەیتون ، کارگەی ڕستن و چنین ، کارگەی دەرمان ،پیشەسازیە قورسەکان کە ئاویان پێویستە.. هەمو ئەو بوارانەی کەرەستەی خاوو دەستی کاریان لە ناوچەکە هەیە.

• پێویستە حکومەت لە ڕێ ی مەسحی جیۆلۆجی و لایەنی بەرپرس خاوەن کارگەکانی چەوو لم ناچار بکات کە پابەندی یاساو ڕێساکان بن و ڕێرەوی سروشتی چەمەکان بە تایبەت سیروان نەشێوێنن،بەردهاڕ بە کاربێنن بۆ ئەوەی پاشماوەزبرەکان بهاڕنەوەو ئەو جۆرە چەوە بۆ قیرو بۆ کۆنکریتیش زۆر باشترە ، هاوکات ئەو هەمو کێوە زیخە لە ناو چەمەکان تەخت دەبن وبەکار دەهێنرێنەوەو بەفیرۆچونی ئاویش کەم دەبێتەوە و ڕارەوەکان ڕێکدەبنەوە.

• بواری ڕۆشنبیری و هونەری گرنگی پێ بدرێت ،شوێنەوارە دێرینەکان لە کفری و کەلار وشوێنەکانی تر بە شێوەی زانستی نوێ بکرێنەوەو بپارێزرێن و بخرێنە چوارچێوەی گەشتیاری و پاراستنی مێژوی ناوچەکەوە ، کۆمەڵگەیەک لە هۆڵ و بینای جیاجیا بۆ کۆنگرەو کۆنفرانس و ئاهەنگ و بۆنە سیاسی ، کلتوری و ڕۆشنبیریەکان بخرێتە پلانەوەو لە شوێنێکی گونجاودا دروست بکرێت کە ئەگەر لە نزیک سیروان یا بەنداوەکە بێت و لە بەرزی باشترە و کارلێکی کلتورەکان و ڕۆحی کێبڕکێ ی داهێنان و گەشەدان بە بەهرەکان پەرەی پێ بدرێت.

•بواری وەرزشی کە لە دنیای سەردەمدا پێش بوارەکانی تر کەوتوە ،لێرەش ئەم سێکتەرە گرنگە لە ڕێی دۆزینەوەو کۆکردنەوەی بەهرەکان و پلانی تۆکمەو ڕاهێنان و پەروەردەکردنەوە ، پەرەی پێ بدرێت و یانەکان ڕێکبخرێنەوەو چالاکتر بکرێن، دەکرێ لە تەواوی شارو شارۆچکەکان تیپی وەرزشی هاوبەشی بەتوانا بە ناوی

گەرمیانەوە لە گشت بوارەکاندا پێک بهێنرێت ، هاوکات کاربکرێت بۆ دابینکردنی شوێنی گونجاوو دیزاینکردنی یاریگایەکی وەرزشی بە ستانداردو مواسەفاتی بەرز ، بودجەی پێویستی بۆ دابین بکرێت.

• ئەنفال و جینۆساید وەکو شوناسی ناوچەکە گرنگیەکی زۆری پێ بدرێت و مۆزەخانەو مۆنۆمێنتی گونجاوو شایستە لە دۆکیۆمێنتاری ، وێنە ،فلم ، ئامارو پەیکەرو کاری هونەری،بەڵگەکانی تاوان ، ناوی تاوانباران، لەگەڵ بەڵگەخانەوهۆڵی سیمیناروچالاکی دروست بکرێت ،دەکرێ هەردییەک مێژو و ژمارەی ئەنفال و ناوو تەمەن ورەگەزو وێنە شوینی خۆی هەبێت بە پێ ناوچەکان و ئەمەش بەوە دەکرێت دەزگایەک یا چەند دەزگایەکی هاوبەش ئامارو کۆکرنەوەی بەڵگەکان بگرنە ئەستۆ ، دەکرێت بە چەند قۆناغێک بکرێت و ببێتە ئەو شوناسەی تەواوی وەفدوروژنامەنوسان ورێکخراوو دەزگاکانی خاچی سور،نەتەوە یەکگرتوەکان، مافی مرۆڤ و جینۆسایدی بیانی و ناوخۆیی سەردانی بکەن وفەرمانگەی تایبەت بە خۆی هەبێت و تەنها نەبێتە یادێک و هەر لە ٤/١٤ بیرمان بکەویتەوە.دەکرێت جەناحێکی تایبەت بکرێت بە شەهیدان و ئەویش بە شێوەیەک کە جیاکاری تێدانەبێت و بە قەبارەی وەک یەکی گونجاو وێنەو زانیاریەکان رێکبخرێت، هاوکات لە رێی نوێنەرانی کورد لە دام و دەزگا فیدراڵیەکان و ئەو دام ودەزگایانەی بایەخ بە جینۆساید دەدەن هەوڵی دۆزینەوەو هێنانەوەی پاشماوەی تەرمی ئەنفالەکان بدرێت.

• شارەوانی کۆنترۆڵی زەوقی گشتی بکات ، بەرپرسبێ لە دیزاین و رەنگ و روی دەرەوەو ژمارەی قاتەکانی هەمو بیناکانی نیشتەجێ بون و ئەوانی تریش، وەکو ئەوەی لە دنیادا پەیڕەو دەکرێت ، بۆ نمونە ئەم شەقامە پێویستە ئەو بینایانەی دەکرێن لە ٣ قات کەمترو زیاتر نەبن ، بە گوێرەی فراوانی جادەکەو رەنگ ودیزاین نزیکبن، نەهێڵرێت ژینگەی چاو بشێوێنرێت، نابێ؛یەکێ یەکقات ،ئەوی تر سێ ، یەکێ سور ئەوی تر رەنگی زەرد،ئەو لە پێشەوە ،ئەو لە دواوە.لانی کەم لە گەڕەکی تازەو بینای نوێدا ئەمە جێگیر بکرێت و جێبەجێ بکرێت.شار پێویستی بە فراوانبونی ستونی و ئەپارتمانی نیشتەجێ بونی بەرزە.

• بواری ژینگەپارێزی و دارناشتن گرنگی زۆری پێ بدرێت، ئەویش بە پلان وقۆناغبەندی وجۆربەندی نەمام ، چونکە روی شار بە سەوزایی سپی دەبێت و شارستانیش بە ژینگەی پاک.

•هەمو ئەو بوارانەش دەکرێ روپێوی وداتابەسیان بۆ بکرێ و بەپێی بودجەو بایەخ بە قۆناغ جێبەجێ بکرێن و هەزاران هەلی کار بۆ خەڵکی ناوچەکە دەرەخسێنن و دەڤەرێکی بەرهەمهێن و گەشەسەندو دەستەبەر دەکەن.



# پەلاماری موجاهیدینی خەڵق لە ئازاری ١٩٩١ دا

ڕزگار حاجی حەمید

ڕێکخراوی موجاهیدین خەڵق ( سازمان مجاهدین خلق ایران ) ئۆپۆزسیونێکە لەناوەڕاستی شەستەکاندا دژی دەسەڵاتی ئێران لەلایەن هەر سێ ئەندازیار ( محەمەدی حەنیف نەژاد,سەعید موحسین و عەبدی نیک بین ) وە دامەزرا , لەکۆتایی ساڵی ١٩٦٦ ( ئەسغەر بدیع زادگان )یشیان بۆ زیادبوو ,ئەم ڕێکخراوە بەشوێن کەوتنی ڕێکخراوەکانی پێش خۆی وبە ئەزموون وەرگرتن لەوان دامەزرا ,لەوانەش ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی (اتحاد مسلمین ایران, جامعە تعلیمات اسلامی, انجمن تبلیغات اسلامی,فیداییان اسلام) هەروەها ڕێکخراوەمارکسییەکانی وەک ( حزب تودە ایران, گروپ پرویزنیکوخا چریک های فدایی خلق ایران , گروە جنگل , گروە فلستین ) ئایدۆلۆجیای ئەم ڕێکخراوە بابەتێکی تەم ومژاوییە , چونکە ئایدۆلۆجیاکەیان قۆناغ بە قۆناغ وبەجۆرێک لە جۆرەکان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە ,هەروەها تێکەڵکردنی سێ ئایدیای وەکو ( ئیسلام وسۆسیالیزم ونەتەوەیی ) کارێکی ئاڵۆزو زەحمەتە ,لەسەرەتادا بە بەرنامەو ئایدۆلۆجیای ئیسلام کاریان دەکرد , بەتایبەت مەزەبی شیعە ونەریتی شۆڕشگێڕانە کەلەناو خەڵکدا باو بوو , ژیرانە توانیان جەماوەر لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە بۆ شۆڕشی چەکدارانە ,هەربۆیە لەشۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ ڕۆڵی کاریگەریان هەبوودژی دەسەڵاتی ( محەمەد ڕەزا شا) تا ڕوخاندنی ,لە سەرەتادا پەیوەندی نێوان موجاهیدین وخومەینی ئاسایی بوو , پاشان ( ئەبولحەسەن بەنی سەدر ) بە یەکەم سەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا ,مەسعود ڕەجەوی لەگەڵ بەنی سەدر هەماهەنگی وهاوپەیمانییەکی سیاسی دروستکرد ,پێکەوە بانگەشەی چاکسازی سیاسی وکۆمەڵایەتیان دەکرد, بەفەرمانی خومەینی , بەنی سەدر لە سەر کار لابرا ,لق ونوسینگەو

ڕۆژنامەکانی سەر بە موجاهیدین داخران ,ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەوکادیرەکانیان دەستگیرکران , مەسعود ڕەجەوی وبەنی سەدر بەفڕۆکەیەک هەڵهاتن بۆ بۆ فەرەنسا, دواتریش لە گەرمەی شەڕوسالّی (١٩٨٦) دا هاتنە ناو عێراقەوە , بەعس ئەم هەلەی قۆزتەوەو پشتیوانی بەهێزی لێدەکردن , لە ساتەوەختی جەنگی عێراق – ئێراندا , هێزێکی زۆرو کەرەستەی جەنگی باشیان لەبەردەستدابوو , ئەو دەمە دەسەلاتی عێراق زۆر سوودمەند بوو لێیان لە هەموو ڕوویەکەوە و بە هەموو شێوەیەک پشتگیری دەکردن ,تا گەیشتە ئەوەی بوونە خاوەن هێزێکی زۆرو کەرەستەی جەنگی باشیان لەبەردەستدابوو , وەلێ لەدوای وەرچەرخانی سیستەمی سیاسی لەعێراقدا گلۆڵیان کەوتە لێژی وئەو پشتگیریەیان نەماو هاوکێشەکە پێچەوانە بووەوە,لە ساتە وەختی هەژموونی ئەمریکا ڕەوشیان باشتر بوو,لەگەڵ لاوازی ئەمریکا لەعێراقدا, بەتایبەت ئێران تادەهات کاریگەری زیاترو ڕۆڵی گەورەی هەبوو لەسەر کۆی کایەکان لە عێراقدا , لەو دوایەداو لە ژێری فشاری ئێراندا حکومەتی نوێی عێراق بڕیاری دا ئەم ڕێکخراوە لێرە نەمێنن , دوابەدوای ئەم بڕیارە لەگەلاوێژی ( ٢٠٠٩) دا سەرەتا لە (خالّس ) خۆپیشاندان ئەنجامدرا تیاییدا دروشمی ئەوەیان بەرز کردەوە( دەبێت لە خاکی عێراق بچنە دەرەوە) ئەمەو بۆ پشتگیری بڕیارەکەی حکومەت و خۆ پیشاندەران , سوپای عێراق و هێزەکانی

ناوخۆ پەلاماری کەمپی ئەشرەف یاندا ,شەڕو پێکدادان ڕوویدا لەنێوان سوپای عێراق و هێزەکانی موجاهیدین خەلّقدا , لەم شەڕەدا چەندین بریندارو کوژراو دیلیان هەبوو , ئەمەش وای کرد ئەندام ولایەنگریان کۆچ بکەن بەرەو ئەوروپا , دواین کاروانیان لەئەیلولی ٢٠١٦ بەرەو وڵاتی ئەلبانیا ڕۆیشتن لەڕێگەی فڕۆکەخانەی نێو دەوڵەتی بەغدادەوە , ئەوەی مەبەستە لێرەدا ڕێکخراوی موجاهیدین خەلّق شانبەشانی هێزەکانی عێراق پەلاماری خەڵکی ڕاپەڕیووی کوردستانیاندا لەئازاری (١٩٩١) دا, بەتایبەت لەدەڤەری گەرمیان , سەرەتا لەناوچەی (خورماتوو – سلێمان بەگ ) وە نزیکەی ( ٣٩ ) کەسیان لەهێزی پێشمەرگەو جەماوەری ڕاپەڕیو شەهید کرد , جگە لەبریندارو بەدیل گرتنی (٢٢) کەسی تر , ئەم ئامارەش زیاتر نەبێت کەمتر نیە, یەکێک لەوانەی دوای بریندار بوون بە دیلی کەوتە دەست موجاهیدین لە شەڕگەی سلێمان بەگ ( داود سەرکەلی ) , ڕوداوەکە وا دەگێڕێتەوە : دوای سەرکەوتنەکانی خەڵک وهێزی پێشمەرگە لە کەلاروکفری وناوچەکە , کەوتینە ڕێ بەرەو ناحیەی جەبارەو لەوێوە بۆسلێمان بەگ ,هێزەکانی بەعس لەهیچ کوێ خۆیان ڕانەدەگرت ,ئێمە هێزێک بووین لەپێشمەرگەو خەڵکی ڕاپەڕیوولەسلێمان بەگ نزیک بووینەوە شەڕێکی سەخت لەناو شاری خورماتوودا هەبوو ,پلانی ئێمە ڕزگارکردنی ئەو ڕێگەسەرەکییەی کەرکوکوک –بەغا بوو

کەئەمەش جیا لەوەی دەبووە سەرکەوتنێکی گەورە ,پاڵپشتێکی گرنگ بوو بۆڕزگارکردنی کەرکوک وخورماتوو ,سەرلەبەیانی ١١ی ئازاری ١٩٩١دوای پێکدادانێکی کەم هێزێکی تۆکمەی موجاهدین کە پێک هاتبوو لە بیست دەبابەو مدەرەعە رووبەرووی ئێمە بوونەوە بە دیسپلینی سەربازییەوە ,هێزی ئێمەش جگە لەچەند پێشمەرگەیەک ئەوانی تر خەڵکی دڵسۆزو راپەڕیوو هەندێکیان پێشتر شەڕییان نەکردبوو تەنانەت بێ چەکیشی تیابوو ,

ەپاش دووکاتژمێر بەفیشەکی کەمەوەو چەکی باشمان پێنەبوو ,شوێنەکەش تەخت وهیچ پەناگەیەکی شەڕی تیانەبوو , ئەوانیش بەچەکی قورس ومدەرەعەو دەبابە وە سەرکەوتووبوون , دەستییان لەکەس نەدەپاراست نەوەک ئەوانەی لەمەیدانی شەڕگە بوون ,تەنانەت لەومنداڵ وپیرانەش لەسەر ڕێکا گشتیەکە هاتوچۆیان دەکرد ,بە چاوی خۆم بینیم بەزریپۆشەکانیان بەسەر زیندوو بریندارو شەهیدەکاندا دەڕۆیشتن ,شەهید ( شوکرڕەشید قەواڵی ) لەدوای شەڕێکی قارەمانانە فیشەکی پێنەما دەستی بەرزکردەوە دەبابە بەسەر لاشەکەیدا چوو پارچەپارچەیان کرد,تەنانەت لەتەنیشتمەوە ( عەزیز ئەحمەد محەمەد ) ئەمەی بینی زۆربێتاقەت بوو, بڕیاری خۆکوشتنی دا هەرچی هەوڵمان دا بێسوود بوو خۆی کوشت , هەروەها حاجی مەحمود باوکی (کاک عوسمان ) لەگەڵ ئەوەشا تەمەنی کردبوو زریپۆشێک بەسەر لاشەکەیدا ڕۆیشت وشەهیدی کرد ,دواتر ئێمە بەدیلگیران (٢٢) کەس خەڵکی کفری وکەلارو دەوروبەری بووین (٧) مانگ زیندانی کراین ,لەوە دەترساین تەسلیمی عێراقمان بکەن ئەم پرسیارەمان دەکرد دەیان ووت : نەخێر عێراقی چی , ئێمە نەمان هێشت حوکمەتی عێراق بڕوخێ تەسلیمی ئەوانتان ناکەین , ئەوان دەیان زانی ئێمە پێشمەرگەی یەکێتین , وێنەی کوژاوەکانی شەڕی قڕناخەو پشتئاشانی ( ساڵی ١٩٨٥) یان پیشان دەداین وەک ئەوەی بڵێن تۆڵەی ئەوەتان لێدەکەینەوە ,تەنانەت بەرپرسێکیان ووتی : ( ئێمە بەهاوکاری هێزەکانی عێراق کوردەکانمان وەدەرنا بۆتورکیاو ئێران ومن لە کەرکوک وچەمچەماڵەوە چووم بۆ سلێمانی و لەکەلارەوە گەڕامەوە, ئێمە هیچ حساب بۆ کورد ناکەین ) کاتێ ئازادییان کردین هێنایانینە ئەو شوێنی شەڕەکە لەوێ ئازادیان کردین , کەدوای حەوت مانگ سوپای عێراقی تیابوو ,ئەمە ئەوەبوو لە سەرەتاوە لێی دەترساین بۆ مێژوو سەربازەکان بردنیانە لای (امر فوج) کە شیعە و خەڵکی( یەنگیجە ) بوو ووتی : ئێوە کێن و لەکوێوە هاتوون ,لەوەڵامدا ووتمان لای موجاهیدین زیندانی بووین تورە بوو , ووتی توخوا ئەمە ووڵاتە , پەنا بەری ووڵاتێکی تر بێت هاوڵاتیانی خۆت زیندانی بکات وبەبێ ئاگاداری دەوڵەت , بڕۆنەوە بۆلای کەسوکارتان

شەڕی سلێمان بەگ جگە لە دیل وبریندار ئەم شەهیدانەی لێکەوتەوە وەك لەخشتەی ژمارە (١) دا هاتووە :

خشتەی ژمارە ( ١)

شەهیدانی شەڕی سلێمان بەگ بەدەستی موجاهیدین لە ١١ی ئازار ١٩٩١

| ز | ناوی تەواوی شەهید | شوێنی لەدایك بوون | ڕۆژی شەهید بوون |
|---|---|---|---|
| 1 | حاجی مەحموود مەحمد رشید | 1933 كارێزە | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 2 | عمر مەحموود مەحمد رشید | 1971 كارێزە | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 3 | محەمەد كريم عيسا (حمە ڕشید) | 1975 هۆمەران | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 4 | عەبدللا حەسەن عەلی | 1966 سۆفی ڕەزا | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 5 | عەلی عەبدللا سدیق مستەفا | 1972 كفری | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 6 | عەزیز ئەحمەد محەمەد عەلی | 1965 كفری | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 7 | محەمەد ئەحمەد محەمەد | 1962 | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 8 | عوسمان حمە غریب ڕەزا عەلی | 1968 گۆبان | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 9 | ئەبوبكر سدیق حسین | 1963دوزدە ئیمام | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 10 | سەمەد ڕەحیم حەسەن محەمەد | 1973ڕزگاری | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 11 | بورهان عەلی ڕۆستم | 1971 دوازدە ئیمام | سلێمان بەگ 1991/3/11 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 12 | شوکر ڕەشید نەجم | 1965 دوازدە ئیمام | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 13 | سەلاحەدین محەمەد ئەحمد | 1963 ئیمام محەمەد | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 14 | شەلال ڕەشید نەجم | 1955 دوازدە ئیمام | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 15 | سالار حەمید حەسەن | 1973 کۆکسی زەنگاباد | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 16 | عەلی مەحموود خەلیفە حەمید | 1971 دوازدە ئیمام | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 17 | عومەر ئەحمەد حەسەن | 1971 ئۆمەربل | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 18 | ئەمیر عومەر ساڵح فەرەج | کفری | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 19 | دارا ڕەشید عەبدلقادر | وەلی هەیەر | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 20 | حەکیم عەزیز ساڵح | 1972 ئیمام محەمەد | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 21 | جەلیل خەلیل ئیبراهیم | 1951 کفری | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 22 | عەلی حەسە لەفتە عەبدوڵڵا | 1953 ئۆمەربل | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 23 | عوسمان کەریم حەسەن | 1968 کنگربان | سلێمان بەگ 1991/3/11 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 24 | حەمید فتاح محەمەد | 1955 بەردەسوور | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 25 | عوسمان حمە غەریب ڕەزا | 1968 گۆبان عەرەب | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 26 | عومەر حەمە ئەمین ساڵەح | 1968 تیلەکۆ | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 27 | محەمەد شوکر | 1957 خورماتوو | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 28 | لوقمان عەبدولڕەحیم فارس | دوازدە ئیمام | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 29 | فەرهاد ڕەحمان ڕەحیم | 1972 دوازدە ئیمام | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 30 | تەحسین سەعید عەبدوڵڵا | | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 31 | ئیحسان وەهاب | | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 32 | تەلعەت شەوکەت مەجید خەتاب | 1968 کەلار | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 33 | محەمەد نامیق تەیب | قەرەبلاغی کۆن | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 34 | ڕێبوار ئەحمەد محەمەد ئەمین | 1973 کەلار | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 35 | مەجید عەزیز عەبدوڵڵا | | سلێمان بەگ 1991/3/11 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 36 | عومەر ئەحمەد سلێمان | | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 37 | شەریف فایق محیدین | 1972 عەلەومحە/کلار | سلێمان بەگ 1991/3/11 |
| 38 | حسام الدین امین | | |
| 39 | ئەحمەد محەمەد قادر | 1972 قەرەبلاغ | سلێمان بەگ 1991/3/11 |

**سەرچاوە : کاری توێژەر پشت بەستن : ئەحمەد باوەڕ , دیوانی شەهید محەمەد پەژارو چاپخانەی کارۆ, ٢٠١٤**

پەلامارێکی تری موجاهیدین خلق لە ١٩٩١/٣/٢٥ لە پرێکدا کەلار روبەرووی شەرێی دەستەو یەخەی دەبابەو هێزەکانی موجاهیدین بووەوە, بەوێنەی سەرکردەکانی کوردو ئالآی کوردستانەوە لەقەرەتەپەوە بەرێ ی کۆکسدا دزەیان کردبوو بەناو هێزی پێشمەرگەدا هاتبوون, بەشێک لە دەبابەکان بۆ پاڵپشتی هێرشەکە لە خوارووی بەستەنەکەی کەلار جێگیر کرابوون وقەلآی شێروانەو ناو شاریان تۆپ باران دەکرد , ئەوانەی هاتنە ناو کەلارەوە کەسێ بۆ چوار دەبابە وتانک بوون ,لەلای بەنزینخانە کەیەکەم دەست رێژیان لە عەلی نەجارکردو شەهیدیان کرد ,خۆیان کردبەشارەکەدا ,هەر بەجادەی سەرەکیدا بەشەهیدو بریندارکردنی چەندین هاووڵاتی , ترس و دڵە ڕاوکێیان دروستکرد,بنکەی سەرەکی کەلاریان گوللە باران کرد,دوا ناقیلەی هێزەکەی مجاهید تێکدەشکێ کەتەواوی چەکداری تانکەشکاوەکانی تریشی تیادابوبو وژمارەیان (١١) کەس بوو ,هەموویان بەنیازی هەڵهاتن دادەبەزن ودەکەونە شەرەتەقە لەگەڵ پێشمەرگە وخۆیان بەدەستەوە نادەن تادەکوژرێن , بەوەش پاشماوەی هێزەکەی دوژمن , ورەیان ڕوخاو کشانەوە , برینداریێکیان لێ بەجێمابوو بەناوی( بەشارەت ) وکوردی ئیلام بوبو وتبووی : ( ڕەتڵەکە دە دەبابەو ناقیلە بووین ) بەمەش شەرەکە بەتێکشکانی موجاهیدین کۆتایی هات وبارو دۆخەکە هێور بوویەوە, بەڵام ئەمە مەترسی ڕاستەقینەی نیشانی دانیشتوانی ناوچەکەدا , کەزۆری نەبرد هەموو قۆڵەکانی گرتەوەوکۆڕەوی لێ کەوتەوە کە لەناوچەی زەندئابادەوە دزەیان کرد لەکوڵەجۆ ( والی خەسرەوحەمید ) یان شەهید کرد , کەگەیشتە قەرەبڵاخ

پێشمەرگەیەکی گەنجی دەربدیخانییان شەهید کرد بەناوی ( عمر حەمە ڕەشید عبدالمحمدعباس ) سێ پێشمەرگەی تریش بریندار بوون, دواتر لەنێوان شێخ لەنگەرو قەرەبلاخ دا هاولاتیەکی بەتەمەنی (٦٧) ساڵەیان شەهید کرد , لەگردەگۆزیەش پیاوێکی بەتەمەنی (٧٣) ساڵەیان شەهید کرد کەناوی ( کەریم عەبولڕەحمان فەتاح ) بوو , لای قەڵای شێروانە (عەدالەت جەبار حوسێن و علی نەجاڕ ) یان شەهید کرد, کوێرانە کەوتنە تەقەکردن لە دانیشتووانی شاری کەلار کرد تەنانەت شارەکەش هەڵهاتن لەترسی دەنگی دۆشەکەکان گیزەی گوللە ئەمان , تاگەیشتنە بەردەم خەستەخانەی گشتی کەلار لێرەش پۆلێک ژن و منالیان شەهید کرد ,یەکێک لەو کەسایەتیانەش کە لەم ڕۆژەدا سەرگەرمی کاری ڕاگەیاندن بوو لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەناو شاری کەلاردا , محەمەد پەژار کەلاری شاعیرو ڕووناکبیری ناسراوو ئەندامی ( یەکێتی ئەدیب و نوسەرانی کورد ) بوو وێرای چەند کەسایەتی و ( دکتۆرە جوان ڕەئوف محەمەدو دکتۆرە زوحا فازل مەرهودی دکتۆرەی خەستەخانەی گشتی کەلاری ئەو کاتە سەرە ڕای خوشکێکی بە ناوی (لەیلا فازل ) کە دەرچووی کشتوکاڵی بوو لەگەڵا سەلار محەمەد میرزا غەفوور کە کچێکی منداڵی تەمەن یازدە ساڵە بوو کچی دکتۆر محەمەد میرزا بوو ) چەند هاولاتیەکی تر کە شەهید کران, هەرچەندە

کتێبێک بەناوی ( تێپەڕین بەناو ئاگردا ) چاوخشاندنێک بەسەر مێژووی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی ئێران لە عێراق , نوسینی شاهۆ گۆران , وەرگێڕانی ئەحمەد زەردەشت , بابەتێکی تیایە بەناوی ( ڕوداوەکەی کەلار) ەوە وا ڕووداوەکەیان خستۆتە ڕوو بەهەندێ بیانوو پاساوی لاوازەوە , گوایە ئەو مەفرەزەیە هەرگیز ڕانەسپێردرا بوون بۆ هێرش کردن , چوون بەوهێزە زۆرەی سوپا هەی بوو ,پێشڕەوی کردن بەرەو شاری کەلار بە یەک مەفرەزە لۆژیکیانە نەبوو , کاتێک بارەگای سەرکردایەتی بۆی دەرکەوت کەمەفرەزەکەی لەو خاڵە دیاری کراوەی تێپەڕی و بەردەوامە بەرەو کەلار , سەرکردایەتی هەوڵی ئەوەی دا پەیوەندیان پێوە بکات , بەلام پەیوەندی بێتەل نەمابوو ,ئەو مەفرەزەیە بەردەوام بوو تاگەیشتنە نزیک شاری کەلار, ئینجا زانیان بە هەڵە ڕۆیشتوون ,لەو کاتەدا هەستیان کرد لە نزیک شاری کەلارن وچوار دەوریان گیراوە , کاتێ بەمەیان زانی , ویستیان وتوو ێژی گەڕانەوەیان لەگەڵدا بکەن بۆ ئەم مەبەستە لە تانکەکانی خۆیان دابەزین , کەوایە ئەم مەفرەزەیە هەرگیز ڕانەسپێردرابوون بەرەو کەلار بچن , لەئەنجامدا تانکەکان سوتێنران , (١٩) چەکدار بوون (١٧) یان لێکوژرا کەدووانیان کوردبوو , شەهریاری ناسری کەخەڵکی کرماشان و( سەید موراد دەولەتیاری ) خەڵکی کامیاران بوو , دووانیان بە دیلی گیران بەناوی ( حەسەن

زولفەقاری و بەشار شەبیبی ) هەر چەندە لەم کتێبەداچەند لاپەڕەیەکیان نوسیووە بەناوی ( ڕوداوەکەی کەلار ) کۆمەڵێک پاساوی لاوازیان هێناوەتەوە و هەندێک چاوپێکەوتنیان سازکردووە تەنانەت لە گەڵ دانیشتووانی کەلاریشدا, منیش دەپرسم ئەگەر ئەمەی کەلار بە هەڵە هاتبوون ئەدی ئەوەی سلێمان بەگ چی بوو ؟ لەکاتێکا مێژووی ڕووداوەکە ١١ ی ئازار بوو( ١٤ ) ڕۆژ پێش کەلار بوو, ژمارەی شەهیدەکانیش زۆر زیاتر بوولە شەهیدەکانی کەلار , یان شەهیدکردنی پیرو مناڵ و کچ وژن لە پای چی , ئەدی دەست ڕێژی گوللەی کوێرانە بەسەر شاردا چ مانایەک دەگەیەنێ جگە لە ڕژاندنی ژەهری قین , دوای هەوڵێکی زۆر تەنها ناوی ئەم شەهیدانەمان دەست کەوت بمانبوورن گەر ناوێکمان بیر چووبێت

هەر لەو ڕۆژەدا کە ( محەمەد پەژار کەلاری ) خوێنی پاکی خۆی کردە قوربانی وڵات و ڕاپەڕین و گەرمیانەکەی وەک ڕۆژێکی

### خشتەی ( ٢ )

### شەهیدانی ڕێگای (گوڵاڵە-کەلار)ە ناو کەلار بەدەستی موجاهیدین ٢٥ی ئازار ١٩٩١

| ژ | ناوی تەواوی شەهید | شوێنی لە دایك بوون | ڕۆژ و شوێنی شەهید بوون |
|---|---|---|---|
| 1 | محمد حسن حەمید(پەژار) | 1954 کەلاری کۆن | 1991/3/25کەلار |
| 2 | دکتورە زوحا فازل مەرهود عۆدە | 1965 بەغداد | 1991/3/25کەلار |
| 3 | لیلا فازل فەرهود عۆدە | 1966 بەغداد | 1991/3/25کەلار |
| 4 | سەلار محمد امین میرزا غەفور | 1980 کەلار | 1991/3/25کەلار |
| 5 | دکتۆرە جوان ڕەئوف محەمەد | 1963 موسڵ | 1991/3/25کەلار |
| 6 | عەدالەت جەبار حسین | 1969 کەلار | 1991/3/25کەلار |
| 7 | کەریم عبدولڕەحمان فەتاح | 1938 گردەگۆزینە | 1991/3/25گردەگۆزینە |
| 8 | جەمال محەمەد فەتاح (جەمال براحەمە) | 1944 قەرەبلاغ | 1991/3/25نێوان شێخ لەنگەرو قەرەبلاخ<br>1991/3/25 کەلار |
| 9 | والی خەسرەو حەمید | 1954 سێتەپان | |
| 10 | علی حسن عبدالرحمن | 1955 کەلار | 1991/3/ 5قەرەبلاخ |
| 11 | عمر حەمە ڕەشید عبدول محەمەدعباس | 1969دەربەندیخان | |

سەرچاوە : کاری توێژەر پشتبەستن :
١-ئەحمەد باوەر , هەمان سەرچاوەی پێشوو و ٢-بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاروباری شەهیدان و ئەنفال کراوانی گەرمیان

مێژوویی هەر لەو ڕۆژەوە بووە یەکەم شاعیر و نوسەر و ڕۆژنامەنوسێک کە لە ڕۆژگاری ڕاپەرین و بۆ داکۆکی کردن لە خاک و وڵاتەکەی گیانی خۆی بەخت بکات و بە بەردەوامی داوای یارمەتی زیاتر و دەسگرۆیی زیاتر بکات بۆ خەڵکی ڕاپەڕیوو،هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە جۆرێک لە یەکێک لەو بروسکانەدا کە دوای شەهید بوونی لە گیرفاتی کراسەکەیدا، دۆزرایەوە و تائێستاش لە ناو دەستنووسەکانیدا پارێزراوە، لەگەڵا چەند پارچە کاغەزێکی تر کە هەر هەموویان خەڵتانی خوێنی ئەورۆژەن ، وەک لە بەشێکیاندا و لە چوار چێوە وناوەڕۆکی بروسکەکەیدا هاتووە )بانگەواز تکایە پێویستمان بە (١٥) پازدە کەس هەیە بۆ بارکردنی دەسکەوتەکانی هێزی پ.م لە مەیدان برایان تکایە هیمەتێ ) دیارە مەبەستی شەهید پەژار لە بروسکەکەیدا (مەیدان) ی ئەوبەری سیروان بووە وێڕای دوو پارچە شیعر کە یەکەمیان: بە ناونیشانی ( ئاسۆی هیوا ) یەو ئەوی کەشیان بێ ناونیشانە وەک: لە برگەیەکی یەکێکیاندا تا دوا تنۆک ئامادەیی و وەفا و بەڵێنی خۆی بۆ نیشتمان و لانەی باب و باپیری دووپات دەکاتەوە و دەنووسێت :

**نیشتمانە دڵگیرەکەم**
**لانەی باوو باپیرەکەم**
**بولبول چەند شەیدای سەرچڵە**
**هەنگ چەند عەزرەتی گوڵە**
**برسی چەند دڵی لای نانە**
**باڵدار چەند شەیدای هەردانە**
**خۆ زۆر زیاتر ئالەمانە**
**پەرێشانتە ئەم گیانە**
**کە بەناوتا دێم ودەچم**
**دەڵێی کەس نیە خۆم نەبم**
**یا چاوم کەوێ بەشوێنێ**
**دەستی دوژمن ئەی ژاکێنێ**
**یان گەل فرۆشێ دەبینم**
**وەختە بمتاسێنێ قینم**
**نیشتمانە دڵگیرەکەم**
**لانەی باوو باپیرەکەم**


١- سەلمان قارەمان رەفیق وبەرزان ئەنوەررەشید ، جۆرناڵ ، ژ ٣٠,تشرینی دووەمی ٢٠١٨

٢-چاوپێکەوتن : داود سەرکەلی پێشمەرگەی دێرین بەشداربوو بریندارو دیلی شەڕەکە ، نیسانی ٢٠١٦

٣- رەحمان خانی ، کوردستانی نوێ پەلاماری موجاهدین بۆکەلار ، ژ (٧٢٢٩) لە ٢٠١٧/٣/٣١, ٢٠١٧/٤/١

٤-شاهۆ گۆران ، تێپەڕین بەناو ئاگردا, وەرگێڕانی ئەحمەد زەردەشت ، چاپی یەکەم ٢٠١٥ ,

٥ –ئەحمەد باوەڕ ,کۆی کردۆتەوە و لەسەری نووسیووە. دیوانی شەهید محەمەد پەژارو چاپخانەی کارۆ ٢٠١٤,

# لە یادی بەقەزاکردنی کەلاردا



د. نزار کاکەم

**ئەمرۆ، ٤٩یەمین ساڵیای بە قەزابوونی کەلارە، ساڵی ١٩٧٠، کەلار لە دێیەکی سەر بە ناحیەی شێروانە (سەرقەڵای ئێستا)وە کرا بە قەزا.**



## کەلاری فرەڕەنگیی

کەلار شارێکە فرە ڕەنگە، ئەنواع و ئەشکاڵ خەڵکی تیایە، پلوراڵە بە مانای کەلیمە، فرە عەشرەتییە، فرە ئاینییە؛ موسوڵمان، کاکەیی، مەسیحی، بنەجوو، لەڕووی مەزهەبیشەوە سوننە و شیعە، جۆرەها شێوەزاری هەیە، تیایەتی لە یەک ماڵدا دووشێوەزار قسە ئەکەن، هی دایک و ئی باوک، کەلاریبوون ناسنامەیەکی ئاڵۆزە، مێژوو و خاڵی دەسپێک و چەقی گەڕەکێک نیە، کەلاریبوون ناسنامەیەکە پەیوەستە بە ڕادەی بۆ کەلار ژیان و، بۆ کەلار کارکردن و، بۆ کەلار ماندووبوون و، لە کەلاردا مانەوە و هیچی تر.

## کەلاری بازاڕیی، کەلاری کەسابەت

مامۆستایەک بۆی گێڕامەوە کە لە ساڵانی حەفتا، لە بەسرەدا، داوای هەر شتێکت بکردایە و نەبووایە، یەکسەر ئەیانووت: بچۆ لە کەلار دەستت دەکەوێ.

کەلار شارێکە سەرەتا بە هۆی ڕاگواستنی لادێکانەوە گەورە بوو، بەڵام گەشەکردن و گەورەتربوونی کەلار پەیوەستە بە بازاڕەکەیەوە، واتە هێزە ئابوورییەکەی، بزوێنەری

گەشەکردن و قەرەباڵەغبوونی کەلارە، لەم شارەدا، ئەوە بازارە کە بووە بە خاڵی لێکنزیکبوونەوەی خەڵکەکەی، دەی کەلاری نزیک لە مەرزی ئێران، کەلاری نێوان سلێمانی بەغدا، کەلاری سەنتەری بازرگانی نێوان ئێران و بەغدا و سلێمانی و دەشتی گەرمیان، وای کردووە بیێتە موگناتیسی ڕاکێشان و کۆکردنەوەی خەڵکانی کاسب و ئەو خەڵکەی بە هۆی ڕاگواستن و کاولکردنی لادێکانییانەوە بێجێگە بوون.

پیاوێکی زەنگینی ئەم شارە بە پزیشکێکی خزمیان، کە دانیشتووی سلێمانییە، وتبوو: وەرە لە کەلار دانیشە ئێرە کیمیایە کیمیایی. مەبەستی ئەوە بوو کە بازارەکەی کەلار پەین و کیمیاوی پیاکراوە ئەوەندەی قازانج و پارەپەیداکردنی تیایە.

## کەلار ڕوحی گەرمیانە

لە ١٩٩٢ەوە و بەردەوام ئەم قسەیە لە (کاکەم)ەوە ئەبیستم، ڕوحییەتی کەلاری ڕوحێتێکی بزێوی پڕ لە جوڵەی نەوەستاوە، هەندێ جار هەستەکەی کەسێکە تەواو سەرقاڵی خۆیەتی بە بێ ئەوەی بیربکاتەوە بۆ، یان بێباک لەوەی کە لە شوێنانی تر چی دەگوزەرێ، ئەتوانێ هەموو شتێ دابینبکا، ئەتوانێ پەلامار بدا، ئەتوانێ زوو بینای بکا، ئەتوانێ یەکسەریش تێکی بدا، ئەوپەڕی متمانەی بە خۆیەتی کە ئەوەی ئەیەوێ ئەبێ ببێ، لە شۆڕشەکاندا جەنگاوەریتی و سینگدەرپەڕیی و چاونەترسیی کەلاری، مارکەیەکە کەلارییەکان شانازی پێوە دەکەن و، شایەتیشی بۆ دەدرێ، لە هەولێر و لە ماڵی پێشمەرگەیەکی کۆندا، دانیشتبووین، لێی پرسیم: خەڵکی کوێی؟ وتم: کەلار. وتی: جەماعەت باوەڕتان هەبێ چەندێ باسی ئەم شار و شار دەکرێ بەڵام بە حەیاتم بەقەدەر کەلاری بە غیرەت و لەشەڕدا بلیمەتم نەدیووە، نیە کەس ناگا بە کەلاریدا.

## کەلاری بێ دەزگایی

ململانێی ڕەنگە فرەکانی کەلار و کێبڕکێی بازارەکەی و ڕوحییەتی ماندونەناسی و نەبوونی دەزگای ئیداری شایستە، وای کردووە کاڵای بە قەد باڵای نەبێ.

لەم شارەدا ئەچیتە هەندێ دەزگا و دائیرە، لە خۆتەوە هەست ئەکەی ئەوی ئەوسەری دیوەخانەکەی گرتووە هی ئەوێ نیە، ئینگلیز ئەڵێن:

(he is unfit for that position)

کەڵچەر، ئەو ئەقڵییەتەیە کە ژیانی پێ مومارەسە ئەکەین، شێوازی مامەڵە کردنە لە گەڵ یەکتر، چۆنێتی هاوکاری کردنی یەکترە، میکانیزمی بەڕێوەبردنی پەیوەندییەکانە، ئەتەکێتی گفتوگۆ و ڕەفتاری ڕۆژانەمانە، کەڵچەر دنیابینی و بەها و داب و نەریتە، پەیوەندییەکی پتەوی بە شێوازی دەسەڵاتەوە هەیە.

کەڵچەری کەلاری، کەڵچەرێکی فرەسیمایی

بازاڕییە، بازاڕی بە مانا پۆزەتیڤەکەی، بە مانا ئەمەریکاییەکەی، بەو مانایەی زۆربەی پەیوەندییەکان لەسەر بنەمای قازانج و زەرەری ئێستایی بەندە، ئەوانەی قازانجت زیاد ئەکەن پەیوەندییەکە توندتر ئەکەن و زەرەرمەندەکانیش شلتر، پەیوەندییەکی ئەمەریکاییانەی ڕوون، زوو توند ئەبێ و زوویش شل، لەگەڵ جوڵەی بازاڕەکەدا، ڕەنگە زۆربەی شوێنەکانی تریش وابن، بەڵام ئەم کولتووره لە کەلاردا زۆر زەقە.

ئەم کەلتووره چەندە باشە بۆ دەسکەوتی زیاتر و قازانجی فرەتر بەڵام، لە غیابی ئیدارەدانێکی ژیرانە، کە لەو جۆربەجۆرییەی، توحفەشارێک و کەڵچەرێکی باڵاتر و ئۆقرەتر بێنێتە دی، ڕەنگە زەمەنێکی زۆر ببڕێ و، بەراورد بە تواناکانی، پێشکەوتنێکی وا نەبینێ. کەلار ئەکرێ و ئەبێ زۆر باشتر بێ لە ئێستای.

## جوانیناسی و جوانکردنی کەلار

جوانیناسی یان ئیستاتیکا، بەشێکە لە پێنج بەشەکەی فەلسەفە، لە بارەی جوانی و ڕەگەزەکانی جوانیی دەکۆڵێتەوە، بایەخ بە سروشت و گرنگیی هونەر دەدا، قوڵبوونەوە لە جوانیناسیدا، دەتگەیەنێتە ئاستێک لە هۆشیاری، کە ئیتر تۆ هەر دیمەنێک، جوڵاو یان وەستاو، ببینی، ڕاستەخۆ و خۆکارانە، بە پێوەری ئەمە جوانە و ئەوە ناشیرینە، پۆلێنیان بکەی. جوانیناسی چەندە پەیوەندی بە مەعریفە و بەدواداچوونەوە هەیە، ئەوەندەیش ڕەگی لە خۆڕسکی مرۆدایە، بەو مانایەی هەندێ جوانی لە ناخەوە هەڵدەقوڵێن و پێویستی بە ڕتوشی مەعریفە نیە، بەڵام مەعریفە لە بارەی جوانییەوە زەرورەتێکە بۆ خولقاندنی دیمەنی جوان.

ئەو کاتەی بە ناو کەلاردا پیاسە دەکەی، دەیان دیمەنی ناشیرین و جوانت بەرچاو دەکەوێ، ئەو دیمەنانە ئاستی زەوق و ڕادەی جوانیناسیی ئەو خەڵکەت بۆ دەردەخا، لە هەمان کاتدا ئەقڵییەتی ئیدارەدانی شارەکەت بۆ دەپێوێ.

سەرباری ئەوەی لە کەلاردا هەیە، کەچی سیما و چیهرە و ڕوویەکی ماندوو و بێزاری هەیە، کە گوزارشت لە بوونی سەدان ناشیرینی کەڵەکەبوو و سەدان جوانیی تێکدراو دەکەن.

کەلار بەو فرەڕەنگییەوە پێویستی بە جوانکردنە، بەو وزە و توانا ئابوورییەوە، پێویستی بەوەیە لە خۆی بپرسێ بۆ جوانتر نیم، پێویستی بەوەیە ئەم هەموو کەرەستە و ئەدەواتی جوانکردنەی هەیەتی، بیکاتە شۆخێکی ڕێکی سەربەخۆ، بیکاتە نیویۆرکی داهاتوو، بیکاتە ئیستەنبول، ببێتە ڕوحی گەرمیانی پارێزگا.

لەم یادەدا، تەمەننا ئەکەم کەلار جوانتر بکرێتەوە، دەستێک بە سیمایدا بهێنرێ و ئەو ڕوحییەتە بزێوەی لە خزمەتی خۆقەشەنگکردن و خۆڕێککردنەوە و جوانکردنەوەی زیاتردا بێ.



# كەشكۆڵی حەمەی شاسواری پوقە لە گەرمیان

## ١٩٣٧ -٢٠٠٤


پ . ی. ئەحمەد باوەڕ

زانكۆی گەرمیان – كۆلیژی پەروەردە


لەڕاستیدا خوالێخۆشبوو حەمەی شاسواری کوڕی قادری ئەلی باوەی ( پوقە)، کە بۆ خۆی بریتییە لە گوندێکی ناوچەی گەرمیان و بەزۆری دانیشتوانەکەشی لەهۆزی گەورەی جافن ، گوندەکەشیان هەر لەمێژەوە لەلایەن دانیشتوان و خەڵکەکەیەوە ئاوەدانکراوەتەوە . لالە حەمەی شاسواریش هەرچەندە بۆخۆی کەسایەتی و پیاوێکی نەخوێندەوار بوو. بەڵام وەکتر تا بڵێی: کەسایەتیەکی قسەخۆشی ، خۆش مەشرەبی ، میوان دۆستی خانەدان و ڕووناکبیرێکی قسە لە ڕوو و زۆر ڕاستگۆ بوو، بەردەوام ماڵ و سایەو مەجلیسی گەرم و کۆمەڵانی خەڵک و میوانی لێ نەدەبڕا. لالە حەمەی شاسوار وەکو خۆی دەیوت : ئەوان لە نەوەی ( دەمان ) و لەتیرەی ( یوسوجانی) سەر بە هۆزی گەورەی جافن ، هەر وەک لە ناوەرۆکی کەشکۆڵە دەستنووسەکەشیدا دەردەکەوێت ، لەسەرەتای سیەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردووداو لە گوندی ( کەوا چەرموو)ی سەر بەشاری کەلاری ئەمڕۆ هاتۆتەدونیاوەو بەزۆری ژیانی ڕۆژانەی بنەماڵەکەیان هەر لەدێر زەمانەوەو بەتایبەتی

پاش قۆناغی گەرمیان و کوێستان کردنی هۆزی گەورەی جاف ، زیاتر بەجووتیاری و سامانی ئاژەڵدارییەوە سەرگەرم بوونە. هەر وەک دەیگێڕنەوە: لالە حەمە لە دوای کۆچی دوایی باوکیەوەو بەتایبەتی لەرێکەوتی ( ١/ ١/ ١٩٦٧)دا، ئیدی زۆر گوێی نەداوەتە کار و کاسبی و زۆربەی زۆری کاتەکانی ڕۆژانەی تەرخانکردووە، بۆ بە تەنگەوە چوون و هاتن و ئامادەبوون، لەخۆشی و ناخۆشی و پرسەو سەردانی کەس و کارو خزم و هاوڕێ و دۆست و ئازیزانی . هاوکات بەشداریکردنی بەردەوامی لە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان ، بەتایبەتی لەسنووری شارەزوور و ناوچەی گەرمیاندا .

شانبەشانی هەموو ئەوانەش لالە حەمە دەفتەرێکی تایبەتی وەک :( کەشکۆڵێک) لە دیوەخانەکەیدا دانابوو ، ڕۆژانە هەر ڕووداوێکی سەرنج ڕاکێش هەبوایە ، ئەو بە خۆش و ناخۆشیانەوە ، بە جوان و ناشیرینیانەوە بەردەوام هەوڵی دەدا لە ڕێگای کەسێکی خوێندەوارەوە و بە نووسینێکی جوان و ڕوون بۆی تۆمار بکردایە و لە کەشکۆڵەکەیدا بینووسیبایەتەوە . جگە لە زۆر سەربردە و شیعر و تەنانەت پەندو قسەی نەستەقی کوردەواریی ، هەموو ئەمانەش بەسەریەکەوە و بەدرێژایی چەندین ساڵی تەمەن ، وەک بەڵگەنامەو دەستنووسێکی بە نرخی لێ هاتبوو . بەتایبەتی هەموو ئەو ڕووداو و بەسەر هاتانەی ، کە بەدرێژایی سەدەی بیستەمی ڕابردوو لە ناوچەی گەرمیان و تەنانەت شوێنانی تریشدا ڕوویاندابوو. بەسەریەکەوە هەموو ئەمانەش بەڵگەو دەلالەتی ئەوەمان دەداتە دەستەوە کە بڵێین : لالە حەمەی شاسواری پوقە بۆ خۆی گەنجینەو سەرچاوەی هەستێکی پاک و خاوێن و فێرگەی سۆزی گەرمی کۆمەڵایەتی بووەو . هەروەک کەسێکی وەک مامۆستا مەحموود کەریمی سەراوی ، کە خزمی بوو و زۆر لە نزیکەوە دەیناسی و هاتوو چۆی گەرم و گوڕو بەردەوامی لەگەڵدا هەبوو ، لە بارەیەوە دەنووسێت : (( لالە حەمەی شاسوار کەسێک بوو هەمیشە وتەی زێرینی لێ دەباری و زۆربەی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی بەرەو کوژاندنەوەو نەمان دەبرد ، گەورەو بچووک هۆگری بوون ، بۆیە لە هەر شوێنێک ئەوی لێ بوایە لێی کۆدەبوونەوە و گوێیان لێ دەگرت )) . هەروەها لەو بارەیەوە و لە دووتوێی کەشکۆڵەکەیدا زۆر ڕاستگۆیانە لە سەری نووسیوەو لە بارەیەوە دەنووسێت: (( لالە حەمە ئەم سەرو ئەو سەری ژیان تێگەیشتبوو ، بەردەوام تۆوی ئاشتی و برایەتی و ڕێزلێنان و داب و نەریت و ڕەوشتی بەرزی ئەچاندو بە زۆریش حەزی لەسەر بەرزی کوردان ئەکرد . هەروەها دوای پەنجا ساڵی و دوای لە دەست دانی زۆرێک لە براو خزم و کەس و کارو هاوڕێ و ئازیزانی ئیتر زۆر بیری لە

مردن کردۆتەوە بۆیە مێژووی کۆچی دوایی زۆر بەیانی نووسیوەتەوە )) و بەوردی لە دەفتەر و کەشکۆڵەکەیدا تۆماری کردوون . بۆ نموونە لە سەرەتای کەشکۆڵەکەیدا ، کە بە یەک بەیتی شیعری دانسقەی خۆی دەست پێ دەکات و دەنووسێت :

سایە و سێبەری دارەکەی دنیا
کەس دانا نیشێ تاسەر لە بنیا

دواتر وەکو وتمان ڕۆژانە هەوڵی دواوە و بەپێی ئەوەی ، کە خەڵکی خوێندەواری دەست کەوتبێ یان سەردانییان کردبێت، ڕۆژ بەڕۆژ ئەم سەربردە و ڕووداوانەی یەک بەدوای یەکدا تۆمار کردوون ، وەک ئەوەی لەبەشێکی سەرەتاکانیدا هاتووە: (( ساڵی ١٨٤٦ سوبحان ئاغا ، سەراوی سوبحان ئاغای شارەزووری ئاوەدانکردۆتەوە)) . هەروەها نووسراوە (( حەمە پاشای جاف لە ساڵی ( ١٨٧٩)دا کوژراوە )) و لەشوێنێکی تریشدا و لە کەشکۆڵەکەیدا، کە بۆخۆی لەگوندێکی دوورە دەستی گەرمیانی وەک پوقەدا هەڵگیراوە ساڵی لەدایک بوون و مردنی سەرکردەو ڕێبەری ناسراوی کورد مەلا مستەفای بارزانی نووسیوەتەوە: (( مەلا مستەفای بارزانی لە ساڵی ( ١٩٠٣ ) دا لە دایک بووە ))( ) . یان لە شوێنێکی تری کەشکۆڵەکەیدا ، وایان بۆ تۆمار کردوە کە گوایە ناوی : (( گوندی سێ و سێ نانی ناوچەی قەرەداغ لە سەمین سێ نانەوە هاتووە )) . هاوکات لە بارەی کۆمەڵێک ڕووداوی مێژوویی و سەربردەی ناوچەی گەرمیان و شاری کەلارەوە ، کەشکۆڵەکەی لالە حەمە ئەم ڕووداوانەمان بەوردی بۆ دەست نیشان دەکات لەوانە : (( لەساڵی ( ١٩١٨) دا ڕووسەکان کەلاریان گرت و خەڵکی عەشایەر بەر پەرچیان داونەتەوە ))( ). (( شەڕی برایم خانی دەلۆ لە ساڵی ( ١٩٢٠ ) دا ڕووی داوە )) . هاوکات نووسیویەتی (( کوژرانی عەزیزی شاسواری تەرخانی لە گردی گەڵکەی مەریوان )) .(( شەڕی حکومەت و وردە شاتری لە شارەزوور لە سەر جادەی سەراو و دوو دارە ١٩٢٤ )). لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا زۆر بە دروستیەوە ساڵی لە دایک بوونی شاعیری میللی گەرمیان حاجی برایمی شاتری و مستەفا بەگی کوڕی کەریم بەگی جاف و دواتریش وا ڕێ کەوتوە ساڵ و ڕێکەوتی مردنیانیشی بە وردی تۆمارکردووە وەک ئەوەی لە کەشکۆلکەیدا هاتوەو نووسراوە : (( حاجی برایمی شاتری لە ساڵی ١٩١٩ دا لە دایک بووە ))( ) . (( مستەفا بەگی کەریم بەگی جاف لە ساڵی ( ١٩٢٠) دا لە دایک بووە )) . دوای چەندین ساڵ و لە شوێنێکی تریدا دەنووسێت : (( سەرۆکی عەشیرەتی جاف مستەفا بەگی کەریم بەگی جاف لە ( ٣٠ / ٧ / ١٩٩٧)دا کۆچی دوایی کردووە )) . لە بارەی شاعیری میللی حاجی برایمی شاترییەوە نووسیویەتی : (( کۆچی دوایی حاجی برایمی شاتری بە نەخۆشی

جەڵتە لە شاری سلێمانی ( ١/ ٤ / ٢٠٠٠) و دواتر ناشتنی بە بەشداری خەڵکێکی زۆر لە گوندی سەید خەلیل ( ٢ / ٤ / ٢٠٠٠ ) لەتەمەنی ( ٨١ ) ساڵیدا )) . یان لە شوێنێکی تردا نووسیویەتی : (( لە دایک بوونی شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی ١٩٣٢)) واتە باوکی شاعیر و رووناکبیری ناسراو کاک فەرهاد شاکەلی. پاشان لەبارەی هەندێک ڕووداوی تری گەرمیان و ناوچەکەوە وردەکاری تری بۆ تۆمار کردووین وەک ئەوەی دەنووسێت : (( شەڕی ئاوباریکی نێوان شێخ مەحمودی حەفید و حکومەتی عێراق و بەریتانیا لەناوچەی گەرمیان پێنجی نیسانی ١٩٣١)) ، دوای ماوەیەکی تر لە دەفتەرو کەشکۆڵەکەیدا هاتووە : (( شەڕی جاف و تاڵەبانی لە هاوینی ساڵی ( ١٩٤٢) دا ڕووی دا لەدێی سەید حوسێن ))( ) کە ئەمەش هەر دەکەوێتە سنووری گەرمیانەوە ، هەروەها لە شوێنێکی دیدا بێ ئەوەی ساڵ و ڕۆژەکەیمان بە وردی بۆ دەست نیشان بکات . بەڵام زۆر بێگومانین لەوەی ، کە دەکەوێتە نێوان ساڵانی ( ١٩٥٩ - ١٩٦٦ ) ەوە و لەو بارەیەوە دەنووسێت : (( حەوت پیاوی ڕۆغزایی لە وڵاتی ئێران تاڵان کران و گیران ، دواتر داود بەگی جاف ( ١٩٠٥ - ١٩٦٦ )( ) لە سەردەمی محەمەد ڕەزا شادا بەرەڵای کردن )) . هەر کە ئەوەش دەڵێم : چونکە دڵنیام لەوەی ، کە مەرحووم داود بەگی کوڕی فەتاح بەگی جاف بەیەکجاری و دوای کۆتایی هێنانی حوکمی پاشایەتی لە عێراق ( ١٩٢١- ١٩٥٨ )دا و بەیەکجاری لە ساڵی ( ١٩٥٩)ەوە، پەنای بردۆتە بەر وڵاتی ئێرانی پەهلەوی و دواتریش لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٦٦) دا هەر لەوێ بە هۆی خوێن بەربوونی گەدەوە ( مەعیدە) وە کۆچی دوایی کردووەو دواتریش هەر لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەکەی لە ڕێگای مەرزی نێودەوڵەتی : ( مەنزەریە - خانەقین ) ەوە دووبارە هێنراوەتەوە باشووری کوردستان و گەرمیان و لە گۆڕستانی بەگزادەکانی جاف لەگوندی ( سەید خەلیل) ئەسپەردەی خاککراوە، تەنانەت هەر لالە حەمە خۆی لە دوو توێی کەشکۆڵەکەیدا و لەبارەیەوە نووسیویەتی: (( داود بەگی جاف لە ئێران کۆچی دوایی کرد ١٩٦٦)) .

هاوکات هەریەک لە خوا لێخۆشبوو مەلا عارفی کوری مەلا یەحیای خانەقین ( ١٩١٢- ١٩٩٨) و مەلا عەزیزی کوڕی محەمەدی شاوارز( ١٩٢٨ ) لەگوندی ( سەوزبڵاخ ) ی ناوچەی بنکوورەش زۆر بە بایەخەوەو لە دەستنووس و یادەورییەکانی ڕۆژانەی خۆیاندا، کە هێشتا بڵاونەکراونەتەوە لەسەر داود بەگی جاف و کۆچی دوایی نووسیوە . بەجۆرێک هەر لەو ساڵەداو لە ڕێکەوتی : (( ١٣/ ٤ / ١٩٦٦)) ی مانگی نیسانیدا ئەوەی بۆ تۆمارکردووین ، کە دەنووسێت :(( کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەی سەرۆک کۆماری عێراق عەبدولسەلام محەمەد عارف لەسەر زۆنگاوەکان لە کاتی چوونیدا بۆ بەسرەوە کوژرانی خۆی و سەرنشینەکانی

)) . جگە لە تۆمارکردنی هەموو ئەو ڕووداو بەسەرهاتانەی باشووری کوردستان و بە تایبەتی ناوچەی گەرمیان ، کە زۆر دڵنیام لەوەی تاڕادەیەکی باش بایەخی مێژوویی خۆیان دەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا مێژوو و سەربردەی دەیان و بگرە سەدان گرتن و کوشتن و ئازاردانی خەڵکی لەلایەن کەسانی سەربە حیزبی بەعسەوە لە ناوچەکەداو لە کەشکۆڵەکەی لالە حەمەی شاسواردا تۆمارکراون و ڕەنگە ناوهێنان و باسکردنی هەندێکیان ئێستا کاتیان نەبێت بۆ نموونە بەوردی نووسیویەتی : (( دەستگیرکردنی ( مام باپیر ) بەدەستی جاشەکانی .... لە نێوان گوندی حەسیرەو میل قاسم ...))دا .یەکێکی دی لەو تۆمارکردنانەی کە هەر لالە حەمە زۆر بایەخی پێ دابێتن و وەکو خۆی هەوڵی تۆمارکردنی دابن زیاتر بریتی یە: لە ڕۆژی وەفاتکردن و سەر نانەوەی زۆرێک لە ڕێبەران و کەسایەتی و شاعیر و پیاوانی ئایینی ناسراوی کوردستان و گەرمیان هەرچەندە بەشێکیان ڕەنگە لای هەندێک بە بایەخەوە سەیرنەکرێت و لێکدانەوەی وردی بۆ نەکرێت . بەڵام وەکتر سەلیقە و ئاوەزو لێکدانەوەی پیاوێکی نەخوێندەواری گەرمیانی دەردەخات بە تایبەتی لە ڕۆژگار و سەروەختێکدا، کە ئەو بۆ خۆی زۆر بە گرنگی زانیون و لە کەشکۆڵەکەی خۆیدا زۆر بە ئەمانەتەوە جێگای بۆ کردوونەتەوە وتۆماری کردوون ، ئێمەش وەکو خۆی و بێ هیچ دەستکاری کردنێک دەیانووسینەوەو لێرەدا هەر هیچ نەبێت ڕۆحی پاکی کەسایەتی و پیاو چاکێکی وڵاتەکەمانی پێ ڕۆشن دەکەینەوە لەوانە: (( کۆچی دوایی شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان ١٨/ ١٠ / ١٩٥٦، کۆچی دوایی مەلا مستەفای بارزانی ١/ ٣ / ١٩٧٩ لە خەستەخانەیەکی واشنتۆن بە نەخۆشی شێرپەنجە ، کۆچی دوایی حمەئەمین بەگی کوڕی کەریم بەگی جاف واتە مینەجافی شاعیر ١٩٦٥ ( )، کۆچی دوایی حاجی قادری شاتری ( ١٨٩٩– ١٩٧٨) ( ) ، کۆچی دوایی شێخ ئەحمەدی شاکەلی شاعیر ( ١٩٠٢– ١٩٨٢)( )، کۆچی دوایی شێخ سەعیدی توران ( ٩/ ٦ / ١٩٨٢ ) ، کۆچی دوایی مەلا مەحموودی گۆبان ( ٢٨/ ١٢/ ١٩٨٧) ، کۆچی دوایی حاجی عەبدوڵڵای فەقێ محەمەدی کەڵۆش ( ٣١/ ١٢/ ١٩٨٦) ، کۆچی دوایی کەسایەتی ناسراوی ناوچەی گەرمیان حاجی شێخ حەسەنی چرچەقەڵا ( ٧ / ٩ / ١٩٩١ )، کۆچی دوایی شاعیری جوانەمەرگ نەبەردی کوڕی حەمە سەعید بەگی جاف بە نەخۆشیەکی کتوپڕ ١٩٩٣ ( برای نووسەری ناسراو خەسرەو جاف ) ، ...تاد ))( ) . ئەمانەو دەیان ڕووداوو سەربردەی دی ، کە هەرهەموویان زۆر بەوردییەوە لە کەشکۆڵەکەی لالە حەمەی شاسواردا جێگایان بۆ کراوەتەوە . سەرەڕای هەموو ئەوانەش و وەک هەر کەشکۆڵێکی دی چەند شیعرێکی جۆر بە جۆر لە ناو کەشکۆڵەکەیدا بەرچاو دەکەوێت و بە شێکیشیان ناوی خاوەنەکانیانی

بەسەرەوە نیەو بەشێکی تریان لە شیعری کەسانی وەک : مامۆستا مەحموود سەراوی ، مامۆستا نووری ناوێک ، مستەفا گۆبانی ، کەمالی کۆمەلایەتی ، جەلالی حەمەی مەحموودەو وەک یادگارێک ، هەر یەکەو بە دەست خەتی خۆیان پێشکەشیان کردووە بەلالە حمەی شاسوار ، ماوەتەوە بلێین : لالە حەمەی شاسواری پوقە بەیەکجاری لە ڕێکەوتی :( ٢٤ / ٣ / ٢٠٠٤ ) دا بەنەخۆشی گەدە( مەعیدە) لەشاری بەغدا کۆچی دوایی کردووەو دوای هێنانەوەی تەرمەکەی دواتر هەر بە تەنیشتی باوکیەوە لە گۆڕستانی ( کەوا چەرموو )ی ناوچەی گەرمیان ئەسپەردەی خاک کراوە. مامۆستا مەحموود سەراویش لە دوا شیعریدا ، کە بەبۆنەی کۆچی دوایی لالە حەمەی شاسوارەوە نووسیویەتی و هاوکات دوا نووسینیشە ، کە ئەکەوێتە کۆتایی کەشکۆڵەکەیەوە بە ناونیشانی : (( پێشکەشە بە گیانی لالەم )) وەو تۆماری کردووە، بەم شێوەیە هەستی خۆی بۆ مەرگی ئەم کەسایەتیە ناسراوەی گەرمیان دەربڕیوە، وەک لە بەشێکیدا و بە زمانێکی زۆر سادە دەنووسێت:

کەوا چەرموو و پوقەو دەشتی ڕزگاری
تاسلۆجەو قوماش ، سەراو و سواری
یوسوجانی و جاف سەرجەم غەمبارن
سەرگەرمی مەرگی حەمەی شاسوارن
هەرچەند بنووسین هێشتا هەر کەمە
ئەم دیاریەم پێشکەش بە لالە حەمە ...

## سەرچاوەو پەراویزەکان :

١- بەپێی لێکدانەوەی دکتۆر حەسەن جاف : حەمەپاشای جاف بەپێی پلانێکی پێش وەختی تیرەی ( کەرەم وەیسی) سەر بەهۆزی جاف لەساڵی ( ١٢٩٩ کۆچی ) بەرانبەر بەساڵی ( ١٨٨١ زایینی ) لەدەشتی چیمەنی ( ئیبراهیم سەمین )ی سەر بەشاری کفری ، لە کاتی گەرمەی ڕاو کردندا ، دەکوژرێت و ئەوانەشی ، کە دەیکوژن دواتر پەنا دەبەنەبەر جوامێر ئاغای سەرۆکی بەناوبانگی هۆزی هەمەوەند بڕوانە: دکتۆر حەسەن جاف، تەئریخی جاف ، دانراوی : کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف ، پێشەکی : محەمەد عەلی قەرەداغی، چ١ ، ( بەغدا : ١٩٩٥)، ل ٥٨ .

٢- مەلا مستەفای بارزانی : کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولسەلامی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای بارزانیە، لە ساڵی ( ١٩٠٣) دا ، لە گوندی بارزان پاش مەرگی باوکی هاتۆتە دونیاوە. هێشتا تەمەنی نەبووەبە ( ٣) ساڵی تەواو لەگەڵ دایکی و کەسوکار و عەبدولسەلامی برا گەورەیدا ، تورکەکان زیندانی دەکەن .هاوکات لەگەڵ کەسوکاریدا و لە شۆڕشی بارزانی ( ١٩٣١— ١٩٣٢) بەدواوە دەکەوێتە ناو ژیانی ئاوارەییەوە ، تا ئەوکاتەی دەهێنرێنەوە شاری سلێمانی و لەساڵی ( ١٩٤٣ ) دا هەلی ئەوەی بۆ دەرەخسێت لە ڕێگای ڕۆژهەلاتی کوردستانەوە ، دەگاتەوە ناوچەی بارزان و شۆڕشی : ( ١٩٤٣- ١٩٤٥) دەست پێدەکاتەوە. سەرەڕای ئەنجامدانی گفتوگۆی بێ ئاکام لەگەڵ کار بە دەستانی عێراقدا ، لە ( ١٩٤٥) بەدواوە لە گەڵ شێخ ئەحمەدی برای و ژمارەیەکی زۆر لە بارزانیەکاندا پەنا دەبەنە بەر

ئێران و ڕۆژهەڵاتی کوردستان و پەیوەندی دەکەنە ( کۆماری کوردستان )ەوە لەمەهاباد و پلەی جەنەراڵی پێ دەدرێت . لە ( ١٦ ئابی ١٩٤٦)دا ، کە پارتی لە بەغدا دادەمەزرێت بارزانی دەکرێتەسەرۆکی . پاش شکستی کۆماری کوردستان ، لە ئاوی ( ئاراس ) دەپەڕێتەوە و پەنا دەباتە بەر یەکێتیی سۆڤیت . تاکاتی بەرپابوونی شۆڕشی ( ١٤ تەمووزی ١٩٥٨ ) لەوێ دەمێنێتەوە . ئینجا دەگەڕێتەوە وڵات و دوای تێکچوونی لەگەڵا عەبدولکەریم قاسمدا لە ئەیلولی ( ١٩٦١ )ەوە دووبارە شۆڕش دەست پێ دەکاتەوە ، تا مۆرکردنی پەیماننامەی جەزائیری ١٩٧٥ بەردەوام دەبێ . لەوە بەدواوە بۆ چارەسەر دەچێتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و لەمارتی ( ١٩٧٩)دا کۆچی دوایی دەکات و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەنێژرێت . لە ڕاپەڕینی ( ١٩٩١ ) بەدواوە دووبارە تەرمەکەی دەهێنرێتەوە ناوچەی بارزان و بە یەکجاری دەنێژرێت بڕوانە: ئەحمەد باوەڕ ، دۆزی کورد لەپەیوەندییەکانی عێراق و ئێراندا ١٩٣٧-١٩٤٧ ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، ( سلێمانی : ٢٠١٤) ، ل ١٩٠- ١٩١.

٣- بە پێی ئەو بەدوا داچوونەی بۆ ئەم مەبەستە کردوومانە ، وای بۆ دەچین هەر کەسێک ئەو ڕووداوە مێژووییەی لە کەشکۆڵەکەی خوالێخۆشبوو لالە حەمەدا تۆمار کردبێت بەهەڵەدا چووە . چونکە ڕووسەکان پێش بەرپابوونی شورشی ئۆکتۆبەری ساڵی ( ١٩١٧) بەماوەیەک هاتوونەتە ناوچەکە و دڵنیاشین لەوەی ، کە لە ( ٧ – ٨ ) نیسانی ساڵی ١٩١٧ دا ، قەڵای مێژوویی شێروانەیان داگیرکردووە و بۆ ماوەیەک تیایدا ماونەتەوەو وەک بنکەیەکی سەربازی بەکاران هێناوە ، چونکە ڕووسیا لێرە بەدواوە لەبەرەی هاوپەیمانان دێتە دەرەوەو سوپاکەیان ناوچەکە بەجێ دێڵێت . تەنانەت لەوێشەوە بەپێی دەستنووسەکانی مەلا محەمەدی جوانرۆیی ( ١٨٦٨ – ١٩٣٨ ) کە بە یەکەم مەلاو وتار بێژی مزگەوتی ئەوکاتەی گوندی کەلاری کۆن دادەنرێت و هەر لەو دەمانەشدا بۆ ماوەیەک لەلایەن لەشکری داگیر کەری ڕووسەوە دەستگیر کراوە و بەدیلی لەگەڵ خۆیاندا بردویانەو پاش ئازاردانێکی دەروونی زۆرو سووتان و لە ناوبردنی کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی ئینجا ئازادیان کردووە . بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە : شکری محمود ندیم ، الجیش الروسی فی حرب العراق ١٩١٤-١٩١٧ ، گ٣ ، مگبعە العانی ، ( بغداد : ١٩٧٤ )، × ٣٢- ٣٣ ، ئەحمەد باوەڕ ، جەلال بیلال مستەفا پیرە بابی یەکەم قائممقامی قەزای کەلار و ڕۆڵی لە بواری کارگێڕیدا ( ١٩٢٣- ١٩٩٣ ) ، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان ، ژمارە ( ٣ ) ، ساڵی ٢٠١٤ ، ل ٧٩- ٨٨ .

٤- حاجی برایمی شاتری : لە ساڵی ( ١٩١٩ )دا ، لە کاتی گەرمیان و کوێستانکردنی هۆزی جافدا لە ( چاڵاو نەخشینە ) ی سەر بە گوندی گلاڵ کەوەی سەربە ناحیەی پێواز هاتۆتە دونیاوە . وەکو خۆی دەنووسێت لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە باوکی مەلای تایبەتی بۆ گرتووەو جزمەکانی : ( عم ، تبارک ) و لە گەڵیشیدا ( گوڵستان ) و ( بوستان ) ی سەعدی شیرازی و ( تاریخی عەجەم ) ی خوێندوە ، لە ساڵی (١٩٤٠ )ەوە ، بەیەکجاری دەستی لە ژیانی گەرمیان و کوێستان هەڵگرتووەو لە گوندی ( قەڵا تەوزان ) ی گەرمیان نیشتە جێ بووە ، ناوبراو شاعیرێکی میللی ناسراوی ناوچەکەیەو

دیارترین بەرهەمەچاپکراوەکانی بریتیە لە : دیوانی جاف ، بەغدا ١٩٨٨ ، کۆچ و بارو گەڕانەوە ، ( سلێمانی : ١٩٩٨ ) . لە ڕێکەوتی ( ١/ ٤ /٢٠٠٠ ) دا لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی ( سەید خەلیل ) نێژراوە ، بڕوانە : حاجی برایمی شاتری ، کۆچ و بارو گەڕانەوە ، دیوانی شیعر ، ( سلێمانی : ١٩٩٨) ،ل ١٠١.

٥- شەڕی جاف و تاڵەبانی : مستەفا نەریمان ( ١٩٢٥ — ١٩٩٤ ) لە بیرەوەریەکانیدا ، لەبارەی شـەڕی نـاو بـراوەوە دەنووسێت: (( ئـەم شەڕە ساڵی ١٩٤٢ لە ئاوایی ( سەید حسین ) ، کە کەوتبووە خوارووی گوندی قەرەبڵاخەوە هەڵگیرسا ، جافەکان هێزیان هێنابوو بۆ ئەوەی ئەو ئاواییە لە چنگ شێخ وەهابی تاڵەبانی دەربهێنن ، دوو کەس لە نێوانیاندا کوژران و حکومەت بەهێزێکی پۆلیس کەوتە ناوەوەو شەڕەکە دامرکایەوەو و دوای ماوەیەک :( تسویە) ئەو ئـەرزەی ، کە ناکۆکی لەسەر بوو لە نێوان هەردوو هۆزی ( تاڵەبانی ) و ( جاف) دا دابەشکردو ئیتر ئەو ناخۆشیە نەماو کوردایەتی و کۆمەڵەی هیوا کۆی کردنەوە )) . بەڵام بەپێی ئەو پرس و بە دوا داچوونەی ئێمە بۆ ئەم ڕووداوەمان کردوە ، ژمارەی کوژراوانی شەڕی ناوبرا و لەوە زیاترن ، کە مامۆستا نەریمان ئاماژەی بۆ کردوون لە وانە : حەمە ئەمینی عەزیزی سەید مراد ، حەمەی ئەحمەدی قیرین ، عەلی ڕەشید بەگۆ ، خەڵەف عەنبەگی ، حەمەی قادری وەلی گل و عیزەدین ناوێکی خەڵکی ناوچەی ئێلانچی لە هەردوولایەن کوژراون بۆ زیاتر بڕوانە : مستەفا نەریمان ، بیرەوەریەکانی ژیانم ، دەزگای ڕۆشبیری و بڵاو کردنەوەی کوردی ، ( بەغدا : ١٩٩٤) ،ل ١١٧.

٦- داود بەگی جاف : ساڵی ١٩٠٥ لە گوندی ( میرە دێ ) ی ناوچەی گەرمیان لە دایک بووە ، کەسایەتیەکی دیار و تارادەیەک شارەزایی لە زمانەکانی : عەرەبی ، تورکی و فارسیدا هەبووەو لە ساڵانی جەنگی یەکەمدا لەسەرسنووری ئێرانەوە دژی لەشکری داگیر کـەری ڕووسیا جەنگاوە ، سەرەڕای هاوکاری کردنی شێخ مەحموود لە شەڕی : ( ئاوباریکی ١٩٣١)دا دژی سوپای عێراق و بەریتانیا لە گەرمیاندا ، جگە لەوەش لە ناوەندی سیەکانی سەدەی ڕابـردووەوە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بووە ، وەک نوێنەری شاری کفری لە لیوای کەرکوک و تاکاتی بەرپابوونی شۆڕشی ( ١٤ تەمووزی ١٩٥٨ ) دوای حوکمی پاشایەتی و لە ساڵی ١٩٥٩ەوە پەنای بردۆتە بەر وڵاتی ئێران و لە ساڵی ( ١٩٦٦) دا لەوێ کۆچی دوایی کردووە ، پاشان لەسنووری ( مەنزەریە)ەوە تەرمەکەی هێنراوەتەوە گەرمیان و لە گۆڕستانی بەگزادەکانی جاف لە :( سەید خەلیل) نێژراوە بڕوانە: میر بـەسری ، نـاودارانـی کـورد ، و: عەبدولخالیق عەلائەدین ، ( هەولێر: ٢٠٠٩) ،ل ٢٠٢، مستەفا نەریمان ، بیرەوەریەکانی ژیانم ،ل ٧٤.

٧- مینە جاف : کوڕی گەورەی کەریم بەگی جافە و لە ساڵی ( ١٩٠٥ ) دا هاتۆتە دونیاوە ، لەدونیای شیعر و ئەدەبیاتی کوردیداا بە ( مینە جاف ( ناسراوەو ناوبراو لە شەڕی ئاوباریکی ( ٥ نیسانی ١٩٣١ ) دا ، شان بەشانی شێخ مەحموود دژی هێزەکانی بەریتانیاو حکومەتی عێراق بەشداری کـردووەو لە ساڵی ( ١٩٩٠ ) دا ، دیوانەکەی بۆ یەکەم لەلایەن مامۆستا نەریمان و دکتۆر

حەسەنی برایەوە بڵاوکرایەوە. بڕوانە : مستەفا نەریمان ، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی ، ( بەغدا : ٢٠٠٧ ) هەروەها بڕوانە : مستەفا نەریمان ، دیوانی مینە جاف ، پێشەکی : دکتۆر حەسەن جاف ( بەغدا : ١٩٩٠ ) .

٨- حاجی قادری مەحموودی شاتری : لە ساڵی ( ١٨٩٨) دا ، لە گەرمیان هاتۆتە دونیاوە ، کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی ناسراو و قسەرۆیشتووی نێو تیرەی ( شاتری) سەر بە هۆزی جاف بووەو سەرەتاکانی خوێندنی لە حوجرەو ناوەندە ئاینیەکانەوە دەست پێکردووە، زمانزانێکی شارەزاو جگە لە کوردی ، عەرەبی و تورکی و فارسی بەباشی زانیووە، وەک دەشگێڕنەوە لە ( شەڕی شوعێبە) ی ساڵی ( ١٩١٥) بەشداری کردووە ، دژی داگیرکای ئینگلیز و لە ساڵی ( ١٩٦٣) دا ، کاتێک سوپای عێراق هێرشی کردۆتە سەرگوندەکەیان ( ژاڵە) لەگەڵ خزم و کەس و کارەکەیدا ، بەرگریان لێ کردووەو تەنانەت برازایەکی بەناوی ( یەحیا )ەوە شەهید بووە ، تا ئەوکاتەی لە ( ٢٥ / ١١ / ١٩٧٨ ) دا ، کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە : عباس العزاوی ، عشائرالعراق ، الجزو الياني ، مكتبە الا×فا والمروى ، ( لندن : دون مكان الگبع ) ، × ٥٣.

٩- شێخ ئەحمەدی شاکەلی : ساڵی ١٩٠٢ لە گوندی شاکەلی ناوچەی گەرمیان هاتۆتە دونیاوە . بە زۆری بەشێک لە بەرهەمە شیعریەکانی لە گۆڤارەکانی : گەلاوێژ ، هەتاو و دەنگی گێتی تازەدا بڵاوکردۆتەوەو ئەندامی ( حیزبی هیوا) بووە. تائێستا دیوانەکەی چەند جارێک لەشاری بەغدا و وڵاتی ئێران و ئەستەمبووڵ چاپکراوەتەوەو لەشوباتی ( ١٩٨٢ ) دا کۆچی دوایی کردووەو لە ( شاکەل ) نێژراوە. بڕوانە: هاشم کاکەیی ، دیوان و یاداشتی شێخ ئەحمەدی شاکەلی ، چ٤ ، ( هەولێر : ٢٠٠٩) .

١٠- نەبەرد محەمەد سەعید جاف : لە ساڵی (١٩٤٨) دا ، لە گوندی کەلاری کۆن لە دایک بووە ، خوێندنی سەرەتایی ، ناوەندی و دواناوەندی لە کەلار و خانەقین و بەغدا تەواوکردووە ، لە ساڵی ( ١٩٦٧ ) دا ، کۆلێژی سەربازی تەواو کردووە پاشان لە ساڵی ١٩٧٢ بەدواوە ، لە زانکۆی تاران بەشی زمانی ئینگلیزی و ئەدەبیاتی فارسی خوێندوە، بە پێی گێڕانەوەی کاک خەسرەو جافی برای ، ماوەیەک پێشمەرگایەتی کردووەو ماوەیەکیش موستەشاری خەفیفەبووە ، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێک بابەتی هەمەجۆری لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی و فارسیەکاندا بڵاو کردۆتەوەو دیارترین بەرهەمە چاپکراوەکانی بریتین لە : ( هەرگیز ناڵێم پەشیمانم ، کۆمەڵە شیعر، نەرویژ ١٩٨٨ ) ، ( بارانی مەرگ ، کۆمەڵە شیعر ، نەرویژ ١٩٨٨) ، ( چروستان ، کۆمەڵە شیعر ، نەرویژ ١٩٨٨) ، ( بەغا ، کۆمەڵە شیعر ، کوردستان ١٩٩٢ ) بڕوانە : خەسرەو جاف ، مێژووی هۆزی جاف ، دەزگای چاپ و پەخشی بەدرخان ، ( هەولێر : ٢٠١٣ )، ل ٦٦٩-٦٧١ .

# لەبیرەوەریەکانی شارەوە

سەعید سەلیم



لەهاوینی ساڵی ١٩٨٨ دەنگۆی ئەوە بڵاو بووە لەکتێبخانەی شاری کەلار کۆڕێکی شیعری خوێندنەوە بۆ کۆمەڵێک شاعیری کەلار ساز دەکرێت و چەند شاعیر و نوسەرێکیش لە دەزگای ڕۆشنبیری کوردی بەغدادەوە دێنە کەلار.

ئێمە هەشتاکان گەنج بووین گەنج بوین و تینوبوین بەو جۆرە کۆڕانە ئەوە بوو لەمانگی ٧ی ١٩٨٨ کۆڕەکە بەسترا ، بەڵام لە چاوپێکەوتنێکدا لەڕۆژی ٢٠١٩/٢/٦ لەگەڵ مامۆستا ابراهیم باجەڵان سەبارەت بەو کۆڕە بەمجۆرە باسی لێوەکرد:

-من ئەوکاتە فەرمانبەر بووم لەفەرمانگەی ئاوی کەلار، بەڕێز دکتۆر «محمد زەهاوی» کە لەدەزگای ڕۆشنبیری کوردی لەبەغداد کاری کردوە هاتە لام و وتی:پێشنیار کراوە کۆڕێکی شیعری بۆشاعیرانی کەلار لەکتێبخانەی گشتی کەلار ڕێکبخرێت پێم خۆشە هاوکاربیت منیش دڵم خۆش بوو ئەوە بوو بە پێشنیارەکە و هاوکاریم کرد ئەوە بوو بانگەوازی کرا کە شاعیران شیعری خۆیان پێشکەش بکەن. شیعرەکان وەرگیراوە لەلایەن لیژنەوە تەتەڵە وبێژنگ کران ، سەرەنجام کۆمەڵێکیان لێ پەسەند کرا و لەمانگی٧ی ١٩٨٨ بەئامادەبوونی

خەلکێکی زۆر لەڕۆشنبیران و ئەدەب دۆستان ، تەنانەت لەبەر بچوکی جێگاکە و زۆری خەلک زۆرێکیان بەپێوە وەستابوون.

ئەوانەی لەبەغدادەوە هاتبوون:

١-محەمەد بەدری شاعیر

٢-مامۆستا مصطفی نەریمان

٣-موختار فائق

٤-زادوق ئادەم

**ئەوشاعیرانەی خەلکی کەلاریش شیعریان خوێندەوە بریتی بوون لە:**

١-خوالێخۆش بوو مامۆستا عوسمان باجەلان

٢-ئارام ئەحمەد جاف

٣-ڕۆوف محمد علی

٤-مەلا حسن حسین باجەلان

کۆڕەکە زۆر گەرم و گۆڕ بوو تیایدا چەندین موداخەلەکرا، چونکە شیعرەکان زیاتر باسی موقاوەمەت و بەرگریان دەکرد

# کەلار و کەلاری
# یا کەلار شاری ناو یادەوەریەکانمان

خاتیرەی :نمە ژاڵەیی



پێش ئەوەی شارێک لەم دەشتەدا سەوز بێ
لەم دەشتە ولەکەناری ئەو شادەماری ژیانی سیروانەدا
ئەسپی شکۆ سمکۆڵانی دەکرد و
سوارەی شەرەف بەقینی پیرۆزەوە بەشوێن داستانی تۆڵەوە بوون ئەمە گەرمیانە
وئێرە کەلارە و پایەختەکەی
لەم دەشتە کرکە وهەردە وهەڵەتەکانیا
هەر بەردێ هەڵدەیتەوە
پڕی ژێریە لە چیرۆک ، لەهاوار و واوەیلا ،دادوفوغان ،لەقەتار وئەلاوەیسی وبەزمی خڕ وچەپڵەڕێزان!
کەلار کاتێ دەکەوێتە خۆی دامێنی کراسەکەی گوڵ گوڵی دەبێ لە گوڵاڵە سوورە
کەواکەی دەبێتە سەوزی قەرسیلی و
دەم وچاوی لەشەرما سوور سوور هەڵدەگەڕێ و
چاوی چوو نێرگس بە ئاونگی بەیانی دائەخا!

*******************************

کەلار شاری ناو یادەوەریەکانی ئێمەیە

مارشی ئەم گەرمیان زەمینە سەلە سەلەیە

سەلە بە سەلاریەکەی

ئاسکی سرکی ڕاووڕامنەکراوی ئەم ناوەیە!

************************

کەلار ئەگەر بەپێچاوپێچی مێژوودا بیگەڕێنیتەوە

حیکایەتی قەڵایەکە لە ڕەنج و

سیروانێکە لە شەکەتی وتەقەلا و ڕۆیشتن

گەنجێتی کەلار تووڕەبوونە وەک گێژەڵوکە لە دڵی دەشتای

هەڵچوونە وەک گڕەی ئاب کاتێ لەگەڵ بای خوارا وەک دەرزی بەگیانی بیماردا دەچزێ!

ئێتر کەلارە کەلار بۆ ماتەم گەروی پڕە لە هەی وەی شێرەی کوڕە شەهیدەکانی و لەشایی ئەوانیشا سەوزە سەوزەیان بۆ یەژێ .

**************************************

کەلار بۆ دەروێشێ :دەفێکە حاڵ بەری نادا

بۆ شاعیرێ : شیعرێکە قەت نانووسرێ

بۆ وتاربێژ : وتارێکە کە ناوترێ

کەلار بۆ سۆفی ودەروێش پیروشێخ و

بۆ شێخ :خۆشی تەریقەتە!

بۆ جوتیار : پەڵەی ڕەحمەتە .

بۆ پیر : چاویلکە وگۆچانە

بۆ گەنج : هاوار ونەخێر ویاخی بوون وبەرخودانە

بۆ کەلاریەک کە دەڕوا

کەلار بەهەشتی گوم شودە وئاهوحەسرەت وگریانە!

*******************************

تۆش بە ڕۆژگاری عومرتا شۆڕ بەرەوە

هەرکوێی خۆت سەیرکەی کەلار دەبینی

کەلار کۆڵانەکانی مناڵیتە بە تەک تەکی ڕۆژەکانی و جومعە وجەژن وهاڕە وهەرای

پاسەکەی حاجی حەسەن وهاوار وهای نەفەری سایەق جێبەکانی ڕێی حەمەی کەریم ولیواکە و ڕۆیشتن بۆ سەر سیروان وقەڵاکە ولام ئەلفەلا وحێ سەرحا ومیم بۆردو وئەلحەمدووەکانی ئەحمەی فەقێ ڕەشی و گەپ وهەوای بەگەکان وهۆرە وسەلە سەلە وبەزمی خڕ وبەهاران و ئێوارانی دەشتی سیروانی شاکەلی و پایز وکەوتنی گەلاویژی حاجی برایمی لێ ئەڕژێ!

مادام کەلاریت ڕازێکت لەگەڵ سیروانا هەیە ،قەڵا نهێنیەکت ئەزانێ ،یاڵ ودۆڵ ودەشت ودەر وباخ وبێستانەکانی هەردووبەر چیرۆکێکی تۆیان لایە !

مادام کەلاریت زوو هەڵدەچیت ،هەروا زووش ئاشت دەبیتەوە ،مادام کەلاریت زوو دەخرۆشێی!

مادام کەلاریت ئیتر سانایی دەتوانی لەیەک کاتدا هەم بگریت وهەم پێ بکەنیت !

کە کەلاریت ،ئیتر هاوڕێی خۆری داخ وبرژێنەری ،هەر سیروان ئارامیت ئەداتێ ،ئیدی بەهۆرە ئاشنای ،هاوڕێی ئاسکی سرک بووی ،لەبەر شەوقی مانگەشەوی دەشتا بۆ خۆت ڕاکشاوی ،تیر لە ئەستێرە ڕاماوی .

کە کەلاریت یانی سەنتەری گەرمیانی ،دڵی پاکی ئەم دەشتە تەخت وسادەیەی ،گەرمیانی وکوێستانیت خۆشدەوێ ،تۆ کەلاریت و کفرییەکانیشت لەخۆت زیاتر خۆشدەوێ ،تۆ کەلاریت هەرکێ لەهەرکوێوە بێ کوڕی شارەکەی تۆیە ،تۆ کەلاریت شەوی بەمانگ تریفەیی بەهارانی ئەو گوێ چەمە وخۆری کز وکاڵی جوانی پایزانە و هاژە ولرفەی زستانانەی خرەشێتی!

کەلاری هەر ڕێک یانی تۆ خوێنی گەرمی گەرمیانی بوونت لێ دەڕژێ ،کەلاری یانی بوێری ،گورج وگۆڵی ،گەرم وگوڕی ،کەلاری یەکسانە بە سادەیی ،سینەسافی ،قسەلەڕوویی!

بەوبەریشا کەلاری بوون هاوتایە بە میهرەبانی ،کەس لێرە غەریب نیە ،هەرکێ لەڕێوە بێ لێرە دەبێتە کەلاری ،کەلار زووتر لەهەرچی شاری دونیایە کەسێک لەخۆدەگرێ ودڵی ئەداتێ!

کەلار ڕق لەکەس ناگرێ ،حەساسیەتی بەهیچ کوێ نیە ،حەسودی بەهیچ کوێ نابا ،کە دەڕۆیت ودێیتەوە تورەنابێ ، دەم وچاو بەیەکا نادا ورووە وەرناگێڕێ!

کەلار عەجەب مەکینەیەکە بۆ بەرهەم هێنانی ئازاکان ،عەجەب دەستی بەخشینێکە ،کەلار کە بەجەبری جوگرافیا لە کەناردایە ،بەڵام شەڕی هەڵکەوتەی خۆشی ئەکا

،بەگژ قولەی قافیشا ئەچێ!
کەلار کە لێی ئەرۆی دڵت لای جێ دەمێنێ وچاوت لەسەری مۆلەق دەوەستێ ،کە بۆی دەگەڕێیتەوە قورسایی سەر سینگت نامێنێ وبەم گەرمایە ئارامیەکی سەیر وفێنکت بۆ دێ !
کەلاری بوون ئینتیمایە بێ پێچ وپلوچ وتەخت ودیارە ،بوونێکی سەرکەش و وزەبەخش وسادە وسونەتیە ،هەر کە کەلاریت یانی ئازایت ،یانی خوێدار وپرمانایت !
**************************

کەلار نامەکانی عیشقی کانی ودەورانی دەزگیرانداری و نیشانەی جیاکەرەوە و لۆگۆی ناسینەوە و هێلانەی ئارامی وماکی بەختەوەری و ڕیزی هەڵپەرکێ و قریوەی سەرچۆپی کێش و هانە ودنەی گەلەدرەو وقورەکاری وهێش وقورەمەی ڕەنج و جۆگای ئاودێری دڵ و بەنداوی خەون و خۆزگەکان وسیروانی ئومێدی ئایندەمانە .
**************************************

تۆ بڕوانە کەلار چۆن بەڕەنگی خاک ڕەنگی کردووی ،تا خاکی بووی، بەدیواری میهرەبانی دەوری داوی ،گەورە بوویت وبەکەلارەوە شێلراوی !
ئیتر ئاوا ئەم ئاوەدانیە پەنجا ساڵانە گەنج نەماوە وەکوجاران وتۆشی لەگەڵ خۆیدا ڕاکێشاوە .
کەلار ئەو جادانەیە هەموو ڕۆژێ پیایاندا دەڕۆی و ئەو مەکتەبەیە لێت خوێند و ئەو دیوەخانی وەفایەیە لەخوارەوەی بۆ بیستنی هەرچی کە وترا دانیشتی!
کەلار زانکۆی دەرچوونی تۆ وهۆڵی زەماوەندەکەت وئەڵقەی پەنجەت و شەوی چوونە پەردەت ومزگەوتی نوێژی جومعەتە!
کەلار ئەو با زاڕەیە پیا شۆڕ ئەبیتەوە و ئەوییە کە ئیشی لێ ئەکەی و خاڵ وچاڵی بیروڕأ وگفت وگۆ و ئەو ناوەیە پێی ئەناسرییتەوە و ئەو ئاشنایەتیە ئاشنای بوویت و ئەو دەنگەیە لە دووی دەگەڕێیت و ئەو چاوەیە ئەبڵەق لەسەرت وەستاوە!
*******************************

ئێستا ئەگەر یاداشتەکانت بنووسی ، کەلاریانە یەژیتی ، کەلاریانەش ئەینووسی ،کەلاریەکانیش دەنووسیتەوە ،چوون تۆ تازە کەلاریت!
ئەمە هەم قەدەر وهەم ناونیشان وهەم داستانی تۆش ئەمەیە!
****************************************

دەی کەلاری کەلار هەڵگرن وقایمی کەن

بژاری کەن لە گەندەڵی
دڕکە کەڵەوی دزی ودەخەڵی تۆوبڕکەن
دەهۆڵی ساختەچی وقۆڵبڕ و قولقولان بازەکانی بدڕن
دەستی دزەکانی ببڕن
کەلار لایەقی جوانیە
بۆ تاڵان وبڕۆ نیە!
دەغەزار وتاڵانچیان شاربەدەر کەن
چەنەباز ودەماخ سز وبەدفیعلەکان بکەنە پەن
شار گوڵڕێژ کەن بە یاسەمین
بۆنی ڕەیحانەشی لێ دەن
کەلارتان خۆش بوێ
کەلار بپارێزن!

*لە فێستیڤاڵی ٤٨ ەمین ساڵڕۆژی کەلاردا خوێنرایەوە

# دۆخی ڕۆشنبیری گەرمیان لە حەفتاکان تا هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو



سۆراخ سالح هەلاج
بەشی زمانی کوردی/ قۆناغی سێیەم

سەرەتای ساڵی (١٩٧٠)ی سەدەی ڕابردوو زەمەنی وەرچەرخانێکی گەورە بوو بۆ ئەدەب و ڕۆشنبیری و سیاسی کورد لە باشووری کوردستاندا، لەبەیانی یانزەی ئازاری ١٩٧٠ دا ڕژێم لە ژێر گوشاری بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلەکەماندا ناچار بوو دان بەمافی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستاندا بنێ، ماوەی چوار ساڵ دانوسان لە نێوان سەرکردایەتی کورد و ڕژێمی عێراق هەلێکی باشی بۆ ڕۆشنبیرانی کورد ڕەخسان بەدەرکردنی دەیان گۆڤار و ڕۆژنامە و لە چاپدانی سەدان کتێب و نامیلکەی جۆرا و جۆر بە زمانی کوردی.......

ئەو دەر فەتەی بۆ ڕۆشنبیرانی کورد لەو سەردەمەدا ڕەخسا، تا ئاوڕ لەو چەند ساڵەی ڕابردووی نووسین و ڕۆشنبیری کورد بدەنەوە، چونکە لە دروست بوونی دەوڵەتی عێراقەوە یەکێک لەو بوارانەی هەمیشە لە هەوڵی شێواندنی دابوون زمان و کلتووری کوردی بوو، هەرچەندە ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کورد درێغیان نەکردووە لە پاراستن و گەشەپێدانی ئەدەب

و ڕۆشنبیری کوردی بەڵام ڕژێمەکان ئەو بوارەیان نەدەدا ئێمەی کوردیش سوود لەو ڕەوتە جیهانیە وەربگرین ڕۆشنبیری کوردیش جگە لە قۆناغی (گۆران) کە ئەدەبی کوردی تێیدا چەقی گرتبوو، بەڵام لە نیوەی دوای شەستەکانەوە جموجۆڵێکی بێ دەنگ و لەسەرخۆ لێرە و لەوێ بوو بووە جێی گفتوگۆ و بیر و بۆچوونی جۆراوجۆر لەسەر ڕەوتی ئەدەب و ڕۆشنبیری کورد بەتایبەتی لەو گۆڕانکاریانەی لە ئەورووپا و لای عەرەبەکانیش هەنگاوی بۆ نرابوو، بەڵام لەسەرەتای حەفتاوە بەتایبەتی دوای بەیانی یانزەی ئازار ئەو هەستەی لای ڕۆشنبیرانی کورد بووە تەقینەوەیەکی گەورە و هەوڵەبەپەلەکانی ڕۆشنبیران بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆ شاییەی لەناو ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا هەبوو، گەرچی پاش بڵاوکردنەوەی بەیانی ئازار ڕژێم کەوتە دروست کردنی گیروگرفت نانەوەبۆ ڕۆشنبیرانی کورد چەندین دەزگای سانسۆری لەسەر وشەی کوردی دانا .

بەڵام ئەدیب و نووسەرانی کورد بێ ترس و سڵکردنەوە بەردەوام لە گەشەپێدانی ڕۆشنبیری کوردیدا بوونە، بۆ ناوچەی گەرمیانیش تایبەتمەندی خۆی هەبوو کە پاشتر دێینە سەری بەتایبەتی هەوڵەکانی گرووپی کفری کە پێشتر بنەمایەکی هەبوو لەم ناوچەیەدا گەرچی ئەویش لە ڕەخنەو تانەی جۆراو جۆر بەدەر نەبوو، بەڵام ئەو ڕەوتە شۆڕشێک بوو قۆناغی(گۆران)ی بەجێ هێشت و قۆناغێکی نوێ تری گرتەبەر، بۆ جوانترکردنی وشەی کوردی، کاریگەری ئەو بزاڤە ئەدەبییە لەو قۆناغەدا لە ناوچەی گەرمیان هاندەرێکی باشبوو بۆ سەر هەست و نەستی لاوە بەهرەمەندەکانی ناوچەکە بەتایبەتی لە بواری شیعر و چیرۆکدا.

پێشتریش هەوڵەکانی مامۆستا(ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل) لە بواری چیرۆکدا لەنیوەی شەستەکان و حەفتاکاندا دەنگێکی زووڵاڵ بوون لە چیرۆکی کوردیدا، لە دەست نیشانکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی کوردەواری، مامۆستا تا ناوەڕاستی هەشتاکان چوار بەرهەمی بە چاپگەیاندووە بە ناوەکانی(دارەکەی بەرماڵمان ، دەستی ئۆخەی ، ئەسپ ، چاوەڕوانی ) کە خۆیان لە ٣٦ چیرۆکدەدا...

کە دێینە سەر چیرۆکەکانی مامۆستا(ئەحمەد شاکەلی )دەبێت ئاوڕێک لە گرووپی شیعری کفری بدەینەوە، چونکە مامۆستا ئەحمەد شاکەلی یەکێک بوو لە دەستەی گرووپی شیعری کفری، مامۆستا پاش بەراوردکردنی چیرۆکی حیکایەت ئامێزی کوردی لەگەڵ ئەو ڕەوتە ئەدەبییە نوێیەی عەرەبی و بیانی چیرۆکی کوردی نەدەبوونە هۆی ڕازی کردنی هەست و نەستی، لەو قۆناغەدا بە گۆڕینی سیما و ناوەڕۆک و دارشتنی چیرۆکی نوێی کوردی لە چیرۆکی باوی پێشتر، هەوڵێک بوو مامۆستا ئەحمەد شاکەلی و کۆمەڵێک چیرۆکنووسی تری کورد بە تەکنیکێکی نوێ وە گەشەیان بە

چیرۆکی کوردیدا، مامۆستا ئەحمەد به چیرۆکەکانی ( شانۆکەیان سووتابوو، گەشت و دووکەڵ و شتی تریش، دووچیرۆک و هەڵوێستێک ، زنجەکانی ژووروو، ئەوەتا ئێوە ئەیلێنەوە، ئاژاوەیە و دڵداری، لەوێ لەسەرەتای ئاژاوەیە، ئەرێ من بۆ ئەوەندە ناوت ئەهێنم، لە ژوورە یەک لەناو یەکەکاندا. هەرچەندە مامۆستا ئەحمەد شاکەلی، لە رووی مێژووییەوە زۆر ستەمی لێکراوە بەڵام یەکێک بووە لە پێشەنگەکانی چیرۆکی نوێی کوردی، مامۆستا عەبدوڵا سابیریش هەر لە کفری لەو رۆژگارەدا به چەند چیرۆکێکی کورت مەڵۆی خستەسەر خەرمانی چیرۆکی کوردی ئەویش دەستێکی جوان و پڕ گوزارشتی چیرۆکی کوردی بوو به چیرۆکەکانی (بووژانەوەی هەستێکی بتەو، لە ئێرانیش گوڵی سوور و چرا هەیە، چڵپاو، هەوری نەخۆش، لە مەرگیش به هێز ترە، لەوێ پێت دەڵێم، گوڵە به رۆژە، سروەی بەیان، شەیدای چوار چاو، بەسەر هاتێکی لە مێژوو درێژ تر) ئەم چیرۆکانەی هەموو لە رۆژنامەی بیری نوێدا بڵاوی کردووەتەوە.

-خوالێخۆشبوان . مستەفا نەریمان، به چیرۆکی (حەمە بۆر ئەچێت بۆ سینەما) شەهید ئەنوەر شێخ ئەحمەد شاکەلی به چیرۆکی (پایزی تەمەن)، غازی دەلۆش به چیرۆکی(بەرەو رۆژ هەڵات ، گریان و پێکەنین) لەو رۆژگارەدا جێ دەستیان دیارە بوو، دکتۆر عزەدین محەمەد ئەمین حارس به چیرۆکی( بەرد سەرین بێ)، مامۆستا لەتیف هەڵمەت بە سێ چیرۆک به ناوی (پاڵتو ، نیو پیتاقە ، ساڵێکی قوتابی)،..... چیرۆکی کوردیان جوانتر کرد، هەموو ئەو چیرۆکانە لە دەیەی حەفتاکاندا بڵاو کراوەتەوە......

لە بواری شیعریشدا کفری ئەو سەردەمە مەڵبەندی ناوچەی گەرمیان بوو خاوەنی گرووپی شیعری کفری بوو، ئەو هەوڵانەی گرووپی کفری لە بواری شیعردا نەک تەنها لە گەرمیان بەڵکو رەنگی بەسەر ئەدەبی تەواوی باشووری کوردستاندا دابووەوە، ئەوەتا (حسێن بەفرین)ی شاعیر دەڵێت: ( لەتیف هەڵمەت) سەرنج راکێشترین و بەبڕشتترین و دیارترین تەقینەوەی شیعری حەفتاکان بوو، دەنگی لە هەمووان زوڵاڵتر بوو لەسەر هەست و نەستی جەماوەر کاریگەر بوو) ١.

ئەو شۆرشە رۆشنبیریە به تایبەتی لە بواری شیعردا هەروا کارێکی ئاسان نەبوو، یاخیبوون لە شیعری باوی پێشتر، ئەو هەوڵانە بۆ جوانترکردنی و به بڕشتترکردنی وشەو سیماو ناوەرۆک و زمانی شیعری شیوازێکی فەنتازی و سەلیقەیەکی باشی خستە ناو دڵ و مێشکی لاوە بەهرەمەندەکانی ناوچەکەوە وەک گوتراوە( شیعر دیوی دەرەوەی ناخی شاعیرە) شاعیریش تاکێکی کۆمەڵە و لە ناو ئازار و ژانەکانی کۆمەڵدا دەژین، بۆیە هەستیارانە لە سەنگەری پێشەوەیە لە قۆناغە جیاجیاکاندا، پێویستە

لە گۆڕانی سەردەمدا پێشڕەوەی بکات، لەم تێڕوانینەدا تاک و کۆ تەواوکەری گیانی بەرەنگار بوونەوەیە لە ستەم و چەوساندنەوە وە سەرچاوە دەگرێ.

ئەو سەردەمە ڕژێمی دەسەڵاتداری عێراقی لە سەرەتای جێبەجێکردنی ئایدۆلۆژیای بیری شۆڤێنیانەی بەعسدا بوو، ئەویش بە سڕینەوەی شوێنەواری کوردەواری بەتایبەتی لە خوارووی گەرمیاندا، بۆیە لەو قۆناغە ناسکەدا ڕۆشنبیرانی کورد بە شێوازی شۆڕشگێڕانە جەماوەریان لەو ئاکامە مەترسیدارە ئاگادار دەکردەوە، هەرچەند کفری خاوەنی دەیان نووسەر و شاعیر بوو، وە گرووپی شیعری کفری پێشڕەوی ڕۆشنبیرانی ناوچەکە بوو، بەڵام ئەو توانا مادییەی نەبوو گۆڤارێک یان ڕۆژنامەیەک دەربکات تا بەرهەمی لاوەکانی تیادا بڵاو بکاتەوە..... سەنتەرێکیش نەبوو بۆ کۆکردنەوەی ڕۆشنبیران ..... تاکە مەڵبەندی ڕۆشنبیری و شوێنی کۆڕ و شیعر خوێندنەوە ( چایخانەکەی قادر ئەبوو شوارب بوو) ئەویش هەرکاتێ مامۆستایان ( لەتیف هەڵمەت و فەرهاد شاکەلی و ئەحمەد شاکەلی و عەلی عەبدوڵا) لە بەغداوە دەگەڕانەوە بۆ کفری لەو چایخانەیەدا لە دەوری مێزێ کۆدە بوونەوە بۆ خوێندنەوەی شیعر و چیرۆک و ڕەخنە و تێبینی ......

یەکەم دیوانی بڵاوکراوەی شیعری لەتیف هەڵمەت( خوا و شارە بچکۆلەکەمان ) لە سەرەتای حەفتاکاندا دەنگ و شێوەی شیعری نوێی کوردی بوو، ئەو سەردەمە لە گشت کوردستان شیعری کوردی لەو بەرگەی پێشوتری هاتەدەرەوە .... ئیتر دنیای شیعری کوردی بە ئاقارێکی تر و ڕەخنە و بوونی ڕۆژانەی گرتەوە خۆی ..... گۆڤار و ڕۆژنامەکان بابەتی نوێ و گفتوگۆی جودا جودای گرتە خۆی، بیری نوێگەری شیعری کوردی پێنایە قۆناغێکی ترەوە، مامۆستا لەتیف هەڵمەت خۆی دەڵێت: ( لە ساڵانی حەفتاکاندا کە ئێمە بەرەومان بەم جۆرە مامەڵەیەدا لەگەڵ زماندا ئیتر شاعیرانی دیش لە ژێر کاری گەریەتی ئێمەدا دوای ئەم ڕێچکە نووسینەکەوتن) ٢.

ئەو هەڵچونە نوێگەریە لە یەکەم کۆمەڵە شیعری ( خوا و شارە بچکۆلەکەمان ) ئەو زمان و ئەزموونە نوێیەی ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە شۆڕشێکی نوێ هاتووەتە ئاراوە لە بەردەوامیشی دڵنیایە وەک لەم کۆپلە شیعرەدا دەڵێت :

شەپۆلی کەفی چڕی هەڵچوونم
ئەکشێ بەسەر مەرگ و چیادا
گۆرانی ئەڵێ بۆ ڕزگار بوونم
هیچ تەگەرەیەک کۆڵی پێنادا

دیارە ئەو زمانە شیعریە هاتبووە ئاراوە ئەوەی لای خوێنەر دروستکرد تا زیاتر بچینە ناو کلتوور و فەرهەنگی کوردیەوە بۆ ئاگا بوون لە ڕۆشنبیری خۆیی و عەرەبی و بیانی ... بۆ تێگەیشتن لە وشەی ڕەمزی ... لە ئەنجامی ئەو فشارەی دەسەڵاتی عێراقی هێنابووی بەسەر کۆمەڵی کوردیدا،

ڕۆشنبیران بە تایبەتی شیعر وچیرۆک دەبوایە پەنایان بۆ وشەی ڕەمزیەکان ببردایە، بەڵام بە شێوەیەکی کاریگەرتر و شۆڕشگێڕانە تر لە شیعری ڕەمزی و سۆفیگەری پێشتر... لەو قۆناغەدا کۆمەڵێ زۆر وشە و دەستەواژەی نوێ هاتنە ناو شیعر و چیرۆکی کوردییەوە وەک، شۆڕش پێشمەرگە ، بۆبما، بابە گوڕگوڕ، زەردەشت ، ئەهریمەن، ئەهورموزدا ، بیکاسۆ، سیزیف ، گلگامش، قوڵە ڕەش، زۆر وشەی تریش ئەڵبەتە ڕمزیش بە پێی لە یەکدانەوەی شاعیر و خوێنەر گوزارشتی جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێت، بۆیە ئەو قۆناغە بووە قۆناغی شۆڕشی ڕۆشنبیری، مامۆستا لەتیف هەڵمەت لە شیعری (قوربانی ) ئاوا مامەڵەی لەگەڵ زماندا کردووە.

قوربانی

من پێم خۆشە لە دەواری هەژارێکدا
چرایەک بم
من پێم خۆشە لە ناو بوخچەی کچی ماڵە
بێ کارێکدا
بازنێک بم ، کەوایەک بم
من پێم خۆشە بۆ هاتوو چۆی دڵدارەکان
ڕێگایەک بم
من پێم خۆشە لە تفەنگی هەموو
چەوساوەکاندا
گلێەی گربم ، باروت بم. ...هتد

هەر لەسەرتای حەفتاکاندا فەرهاد شاکەلی ئەویش دەنگێکی زوڵاڵ و پر برشتی گرووپی شیعری کفری بوو یەکەم کۆمەڵە شیعری بە ناوی( پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی ) بڵاو کردەوە، ئەم کۆمەڵە شیعرە دەنگێکی تری بزاڤی شیعری کفری بوو ئەو جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ زمان و سەردەم وریاکردنەوەیەکی خێرا بە جەماوەر دەدات لە داهاتووی سیاسی و ڕۆشنبیری و خاک و مێژوومان، لێرەدا خواستەکانی شاعیر بە ئاشکرا بە دیار دەکەون وە بازدانێکی گەورە و پرگوزارشت لە ئەدەبی کوردیدا بنیات دەنێت ئەوەتا لە پێشەکی نامیلکەی (پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی )دا دەڵێت:
(هۆنراوەکانم بەو پەڕی شانازییەوە ڕوو لە خوێنەران و مێژووی ئەدەبیمان ئەکەن وەکو پێشەنگی قۆناغی سەرهەڵدانی کە قۆناغی (گۆران) بەجێ ئەهێڵێ و هۆنراوەی ئەمرۆی کوردستان دیاری ئەکات)٣ .
هەر لەسەرەتای حەفتاکاندا ڕژێمی عێراق یەکەم هەوڵی بۆ ترس و تۆقاندنی خەڵکی عێراق و کوردستان کەوتە گرتن و بیانووگرتن بە کوردە فەیلییەکان ئەو سیاسەتە شۆڤێنیەی ڕژێمی عێراق زەنگێکی مەترسی داربوولە داهاتووی گەلەکەمان، فەرهادی شاعیر کە توانایەکی هەستیار و بە درکە وەک سەرەتایەک لەو نهێنییەی ڕژێم پەنا بۆ شیعر دەبات و بە وشە و زمان هاوار ئەکات بەسەر مانداو لە داهاتوویەکی پرمەترسی ئاگادارمان دەکاتەوە، شیعریش توانای گەورەی هەیە لەسەر هەستەکان و بەدەنگەوە هاتن و بەرەنگاری کردنەوە لە

جولآن و هەست و هۆشی کۆمەڵ لە ئەنجامی ئەو ڕەفتارانەی ڕژێم لەو قۆناغەدا فەرهاد شاکەلی لە بەشێکی شیعری ( دوا پەڕەی ڕشتەی مرواری) بەم جۆرە فرمێسکی وشەکانی ڕشتە سەر کاغەز و دەڵێت :

هاوڕێم هاوڕێی هەزار ساڵەم
نامەکانت
لە ئاگری سنورەکان ئە سوتێن
لەدۆزەخی ئەو دیوەوە
بۆ دۆزەخی ئەم دیو نایەن
وەکو هیوای
هەڵبزرکاومان ئەسوتێن
وەکو تاسەی
دیداری یەکتر ئەخنکێن
نامەکانت کە پێم ناگەن
لە پۆستەخانەی پایتەخت
پرسیار ئەکەم
بۆچی ڕێگای
نامەی برا ئاوارەکەم نادەن بگات
ئەڵێن چونکە ئەو فەیلی یە......!!!

ئەو بزاڤە شیعرییەی شیعری کفری دەرگای لەبەردەم لاوە بەهرەمەندەکانی ئەم ناوچەیە دا کردەوە ژان و ئازارەکانی کۆمەڵیان کردە هەوێنی شیعرەکانیان و هاتنە مەیدانی شیعر و وشەی کوردیەوە هەر لەو سەردەمەدا مامۆستا کەنعان مەدحەت بە زمانێکی فەنتازی و ڕوخسارێکی نوێی شیعری ڕەمزی، لە هۆنراوەی ( سۆزێکی هەڵقولاوە لە باوەشتەوە) بەم جۆرە ئەچرپێنێ بە هەست و نەستی خوێنەردا،

سۆزێکی هەڵقولاوە لە باوەشتەوە
کاتێ وشە پاکیزەکەم
سوار کەژاوەی دەمت ئەبێ
کاتێ بووکی مەبەستەکان،
یادی زینیان لێ هەڵئەسێ...
مەلی زیوی ئەستێرەکان
باڵە فڕێ ئەیانگرێ. ...هتد

هەر لەو ڕۆژگارەدا چەند دەنگێکی تری شیعری لە گەرمیاندا هاتنە ناو گۆڕەپانی شیعرەوە وەکو شاعیری جوانە مەرگ (فەریق ئەمین، ساڵح هەلاج و عەبدوڵا قەرەداغی و مامۆستا سەلاح عەبدولحەمید و عومەر فارس و تایر شێواو. و مەهاباد قەرەداغی و فاتیح سەلام وجەلال شوکر باغەوان و مەحمود حەمە ڕەشیدمیل قاسمی و ناهیدە سروشت. لە کەلاریش شەهید مەلا ئەحمەد ناسراو بە ئەحمەد باوەڕ، شەهید محەممەد پەژار و مامۆستا عەبدولا حەسەن قادر و حەسەن عەلی سەلیم بەگ و قادر ئەحمەد شاسوار، لە قەرەبلاغیش مەحمەد ئەحمەد برا حەمە، لە خورماتووش بورهان بەرزنجی، ئەم ناوانە تاوەکو ئێستاش زۆریان دەنگی شیعریان بەردەوامە و هەندێکیشیان زوو وازیانهێنا لە شیعریەت.
فەریق ئەمینی جوانە مەرگ ساڵی ١٩٥٥ لە گوندی عەزیز قادر لە دایک بووە،

مەرگ مەودای نەدا لە تەمەنێکی کورت و توانایەکی شیعری زۆردا، خاوەنی کۆمەڵێ شیعری بەرەنگاری بوو، بەڵام مەرگ بواری نەدا لە تەمەنی ٢٤ساڵیدا و لەبەشی کوردی قۆناغی سێی زانکۆی بەغدا ١٩٧٩ کۆچی دوایی کرد، تا لەژیاندا بوو چەند شیعرێکی لە گۆڤارەکانی ڕۆشنبیری نوێ و بەیان و ڕۆژی کوردستاندا بڵاوکردووەتەوە لە چەند کۆڕێکی گەورەشدا شیعری خوێندووەتەوە پاش کۆچکردنی شیعرەکانی بێناز کەوتن، تا ئەم ساڵانەی دوایی مامۆستا ئەحمەد باوەڕ هەموو شیعرەکانی لە دووتوێی کتێبێکی خنجیلانەدا بە چاپگەیاند...

لەم کۆپلە شیعرەدا لەسەرەتای ڕاگواستنی دێهاتەکانی ئەوبەری سیروان و ناوچەی خانەقیندا دەڵێت:

لافاوی گریانێکی چڕ
شیرازەی هەستمی بزوان
لە ڕووی دەشتی گەرمیانەوە
زامە سەختەکانی سیروان
سیروان سیروان
بۆ وا ئەگری ئەرێژی ئەم ڕەهێڵەیە
بە هەنسکی فرمێسکەوە سیروان ووتی:
پەڕوو باڵی شەپۆلەکانم واوەری
نایەتە گوێم، نە ئای ئای یە، نە هۆرەیە
ئەگەر گوێسەبانە نەبێ
چۆلەکە لە کوێ لانەبکا،
ئەگەر ماسیش نەبێ ڕووبار
پرچی بۆکێ شانە بکا....!

ساڵح هەلاجیش هەر لەو قۆناغەدا لە هەوڵدانێکی نوێگەریدا لە شیعری ( پەیامێک لە زەردەشتەوە ) دا دەڵێت :

خۆشەویستم ،
چاوگی دەریای وشەکانم
هێشتا لیڵە ،
دێڕی بەیتی شیعرەکانم
بەدوای نیگای هەتاوێکی گەشدا وێڵە ،
ئەو ڕێگایەی کە بۆی دەگری
پێچاوپێچ و سەخت و دوورە ،
زەردە پەڕێ دەستی نایە بینی هەتاو
بۆلێڵێکی بێ سنوورە....
ئەو کۆترەی بە شوێن خۆری هیوا ونە
کۆتی وێڵی لە گەردنە ،
کۆتی وێڵی
بزەی لێوی منداڵەکان ئەتۆرێنێ ،
پێڵوی سرێ ئەم تابلۆیە
هێشتا دەریای چاوەڕوانی
ئەیخواتەوە، نەتروکاوە
هێشتا نەخشە و بزەی زەردەشت
بانگم دەکا و کۆتکراوە ،
ئێمە تینووی هەواڵێکین
تاسەی کزەی شەماڵێکین
ماندووی وشەی ئاگرێکین
زامەکانمان بشواتەوە
١٩٧١

شەهید ئەحمەد حەمە ئەمین نازناوی شیعری (ئەحمەد باوەڕ) ئەم کەڵە پیاوە لە زۆر بواری شۆڕشگێڕیدا جێ دەستی دیار بووە. پاشان تێکەڵاوی سیاسەت و

پێشمەرگایەتی بوو لاوێکی بەتوانا و خاوەن بیر و باوەڕێکی گەورە بوو شەهید مەلا ئەحمەد بە لاوی شاعیر و ئەدیب بوو ساڵی ١٩٧٩ بووە بە پێشمەرگە و ئیتر وازی لە شیعر نووسین هێنا سەدمەخابن ڕۆژی ١٩-٢-١٩٨٩ لەکاتی پارتیزانیدا، حەشارگەی داری خلە هەرەس دەکات بەسەریاندا و خۆی هەڤاڵەکانی شەهید دەبن.

شەهید مەلا ساڵی ١٩٧٨ پارچە هۆنراوەیەکی لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٥٢ لاپەڕە ٨١ بڵاوکراوەتەوە گۆڤارەکە ئەم چەند دێڕەی بۆ نووسی بوو

«کاک ئەحمەد باوەڕ لەکەلار ئەگەر باوەڕت بە توانای خۆت بە هێزبێت ئەتوانی ببی بە شاعیر ئەمیش بە شێکە لە شیعرەکەت».

بەهار شەیدای بارانێکە
خەمەکانی بیابانی بشواتەوە
بەفر شەیدای کاروانێکە
وەکو ساڵان
تینووی هەزاران بشکێنێ
منیش شەیدای وشەیەکم
ئاوارەیە ئاوارەیە ،

هەر لە کەلار لەو ساڵانەدا دەنگێکی تری شەیدای وشەی کوردی و کورد پەروەرێکی بەوەفا تا بە شەهید بوونی یەک کاتی لە کتێب و شیعر دوورنەکەوتوەتەوە سەرەڕای ئەوەی لە ڕادیۆی کوردی بەغدا دوو بەرنامەی هەبوو یەکەم بەناوی (چەند لا پەڕەیەک لە مێژووی عێراق) لە ئامادەکردنی (دکتۆر کەمال مەزهەر) و پێشکەشکردنی شەهید(محەمەد پەژار) بوو بەرنامەی دووەمی بەناوی (کاروانی شیعر و مۆسیقا ) لە ئامادەکردن و پێشکەشکردنی خۆی بوو، شەهید محەمەد پەژار ئەندامی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی و یەکێتی ئەدیب و نوسەرانی کوردیش بووە، کاری ڕۆژنامەوانیشی کردووە و چەندین بابەتی بەزمانی کوردی و عەرەبی جۆراوجۆر لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا بڵاوکردوەتەوە، بەڵام بە داخێکی زۆرەوە ڕۆژی ٢٧-٣-١٩٩١ چەتە بە کرێگیراوەکانی موجاهیدی خەڵکی ئێران پەلاماری خەڵکی ڕاپەڕیوی کەلاریاندا کۆمەڵێ خەڵکی بێ دیفاعی شارەکەیان شەهیدکرد یەکێک لەو شەهیدانە شاعیر و نووسەری جوانەمەرگ (محەمەد پەژار) بوو لە پاش مەرگی کۆمەڵێ شیعری جوانی بە یادگاری بۆ بە جێ هێشتین لە لایەن مامۆستایان (سەرکۆی حمەی ڕۆستەم،دکتۆرئەحمەد باوەڕ)وە دووجار چاپکران ئەمەیش پارچە هۆنراوەیەکی سەرەتای نووسینیەتی.....

ئاوە جوانەکەی خاکی کوردستان
فێنک کەرەوەی دەروون لە نیهان
ڕەهێڵەت وێنەی ڕەهێڵەی تاسەم
ساردیشت وێنەی ساردی هەناسەم
ئاسمانی ڕوونم وەکو تۆ لێڵە
ئەستێرەی حەز و ئاوەزووم وێڵە
گەربێتو ڕۆژێ بتدۆزمەوە
وەک واشە و هەڵۆ ئەیقۆزمەوە

عەبدوڵا قەرەداغیش دەنگێکی تری شیعری

کفری ئەو ڕۆژگارەبوو، زەمانێکی پاراو و بە بڕشتی گرووپی کفری بوو ئەزموونێکی باشی هەبوو لە ڕەوتی نوێگەری جیهانی و خۆیی و لە واقعی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردەواریدا،لە وێنەی شیعریدا عەشقی خاک بە عەشقێکی پیرۆز و سەنگەر و شۆڕش و پێشمەرگە لە وشەگەلێکی ڕەمزیدا ڕازەکانی دەخوڵقێنێ لە بەشێک لە شیعری (ئەو بنارە بۆ دەنگ ئەژێ) دا دەڵێت:

سەرنجێکی سەرپێیی بووم
کاتێ شەونم دوا گۆرانی بۆ هەتاو درەخت
ئەوت
گوێم هۆگری ئاوازت بوو
هۆشم دڵمی ئەکرد بە تۆ
تۆ لە ناخما ئەتوایتەوە
گەرچی دوور بووین ئە بووین بەیەک
بۆ سەربەستی ئەم جیهانە.
خەونمان ئە بوو بەڕەشبەڵەک
ئاگردانی سەر گۆی خەم و ئێشەکانمان
گەرچی دڵی هەزارانی ئەبرد بۆ خۆی ،
کەزانیمان ڕووبار خوڕە و،
چیاکانیش بوونە ئاسۆی ...

کە زانیمان خەو ئەخزێتە گەرووی ژانمان
دژ بە بۆبمای نیوترۆن و مەرگی ئینسان
یەکمان گرت و بۆ دڵێکی ڕوونتر ژیاین...
خوالێخۆشبووعومەر فارس ئەدیب و شاعیریش لە کۆپلەی شیعرێکدا بە زمانێکی سادە و شیعرێکی تەنز ئامێز بە داگیرکەر دەڵێت:

گەورەکانم
گەرتوانیتان منداڵ لە شیعر بتۆرێنن
سەگی برسی لە کولێرە بڕەنجێنن
گەرتوانیتان مێشکی تورەی
(حمە دۆینە)ش بڕوخێنن
ئەو کاتەش هەر بۆتان ناکرێ
شیعرەکانم بتاسێنن
ئەوە چەند جارم پێ ووتن
شیعرەکانم لە کرۆکی دڵەکەمدا هەڵئەقوڵێن
دابین نابن ، سەر شۆڕناکەن
بەهیچ پارەیەک نادۆڕێن
چیان لێ بکەم
وەک خۆم شێتن!
مامۆستا (سەلاح عەبدولحەمیدیش ) سەلاح پەرلەمان هەر لەو ڕۆژگارەدا بە ئەندێشە خەونە بێ ئۆقرەییەکانی خۆیدا هەڵئەشاخێ و ئەڵێت:

دەنگێک
گوێم زرنگا لە نیوەی شەو
لە کاتێکدا
هێشتا چاوم نە چوو بووە خەو
گوێم زرنگا
بەدەنگێکی بە سۆزی دوور
لەسەر سنوور
هەردێمەوە
هۆ دایەگیان
ئاوی ساردی یەک موغارە
بخۆمەوە
هەردێمەوە دەست بەخەنەی
زەماوەندی هاوڕێکانم

له پیرەگۆم ، بشۆمەوە
هەردیمەوە دارەکانی باوەشاسوار
بکەم بە تابووت بۆ زۆردار!

(فاتیح سەلام ) لەم کۆپلە جوانەدا ئەوانە بە ئاگادارێنیتەوە شیعر دەنووسن و دەڵێت:

گەرناتوانی
شیعر بکەی بە پێشمەرگە یا نارنجۆک
دەمت داخە مەبە شاعیر
بە خێسەیەک مەیە سەرچۆک

گەر بە سەرنجێکی ورد بینانە بابەتەکانی ئەو ڕۆژگارە بخوێنینەوە ئەم شاعیرانە له شیعرەکانیاندا ئەوەمان بۆ ئەسەلمێنن. ئەو ڕۆژگارە پرهەراو هوریایە چی شۆرشێکیان هەڵگیرساندوە، چۆن بە کەرەستەی زمان بەرەنگاری نیازە گڵاوەکانی ڕژێمی داگیرکەربوونەتەوە (خاک و گەل و زمان و مێژوو کلتوور بوونەتە هەوێنی شیعرە پرگوزارشتەکانیان بۆ کوردستان و بەتایبەتی دەڤەری گەرمیان کەلەبەردەم هەرەشەی تەعریبدا بوو، قۆناغێکی پر مەترسیدار بوو، خەباتی ڕزگاری خوازی گەلەکەشمان، دیسان قۆناغێکی هەستیار بوو بەتایبەتی هەڵگیرساندنی شۆڕش ساڵی ١٩٧٤ گەلە کۆمەیەکی سیاسەتی دەولی و هەرێمایەتی لەسەر شۆڕشی کورد و نسکۆی شۆڕشی ١٤ ساڵەی ئەیلول و دەسپێکردنی تەرحیل و نەفی کردنی دەیان هەزار کورد بۆ خوارووی عێراق و درووستکرنی پشتێوینەی ئەمنی سنوورەکان جارێکی تر هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێی گەلی کوردستان کە ڕووبەڕووی ڕژێمێکی تۆتالیتاری بەعس بووبووەوە، لەو قۆناغەدا تاکی کورد گرێ درابوو بە کێشەی کۆمەڵەوە بێ جیاوازی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند و کرێکار و بۆرژواز و جوتیار و خاوەن زەوی و پێشمەرگە و هاوڵاتی شار و لادێ نێر و مێ گەورە و بچووک خاک و مێژوو و گەل و کلتوور بە گشتی لەبەردەم هەرەشەی سڕینەوەدا بوون، دەبوو ڕۆشبیرانیش ڕۆڵی خۆیان وەک پێشمەرگە ببینن دژی هەموو هەرەشەیەکی ئایندە . ڕۆشنبیری بەرەنگاری کوردی لە ئەزموونێکی نوێگەری بە چەکی کوردایەتی سەنگەری شۆڕش و پێشمەرگایەتیان هەڵبژارد چ لە شاخ چ لە شار مل کەچی ڕۆشنبیری داگیرکەر نەبوونەوە...

**سەرچاوەکان:**

١ - گۆڤاری نووسەری کوردستان ژمارە (١٦) لاپەرە ٣٦ ساڵی ١٩٨٩
٢ - شیعر- خەنافس تەنوورەی مینیجۆب لاپەرە ٣٤٥
٣ پرۆژەی کوودەتایەکی نهێنی ساڵی ١٩٧٣بەغدا



# بەتایبەت کردن (الخصخصه)

ڕاقیار ئەحمەد محەمەد

لەساڵانی شەستەکان و سەرەتاکانی هافتاکاندا ئابووری وڵاتان تا ڕادەیەک جێگیر بوو, بەڵام لە کۆتایی هەفتاکاندا کەرتی گشتی تووشی بار گرانی زۆر بوو لەسەر ئابووری زۆربەی وڵاتان, بەهۆی نزم بوونەوەی ئاستی لێهاتووی و شڵەژانی جۆری وکەڵەکە بوونی زەرەرەکانی دراو ئەمەش بووە بار قوورسی بەسەر بوودجەی گشتی بۆ زۆربەی وڵاتان لە ئەنجامدا بووە هۆی کەڵەکە بوونی قەرزەکان لە سەریان. کاریگەری ئەمانە لە گەڵ قەیرانی ئابووری لە سیستەمی سەرمایە داری جیهانی وای کرد ببێتە هۆی نزم بوونەوەی گەشەی ئابووری و گەڕانەوەی خواست لەسەر کەرستە خاوەکان و شلۆقبوونی تێکڕای ئاڵووگۆڕی بازرگانی لە ولاتانی دوا کەوتوو, وە ڕەنگ دانەوەی لەسەر سیاسەتی دراوی و بەرز بوونەوەی نرخی سوو لەولاتانی سەرمایە داری پێشکەوتوو کەوایکرد زیاتر باری قورس بکات ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە وڵاتان نەتوانن بە ئاسانی خۆیان لەژێر ئەو بارە قوورسە دەرباز بکەن کە لە ئەنجامی پرۆسەی بەتایبەت کردندا ڕووبەڕووی بووبوونەوە, هەر بۆیە بەتایبەت کردن چەندین خاڵی باش و خراپ لە خۆ دەگرێ:

حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ئەنجامی ڕوانینی بۆ وڵاتانی دەوروبەر لە کاتی ئەنجام دانی پرۆسەی گواستنەوەی کەرتی گشتی بۆ کەرتی تایبەت بە هۆی سەرکەوتنەکانی ئەوان لەو پرۆسەیەدا هەوڵی گواستنەوەی چەند کەرتێکی داوە, بە وەزارەتی کارەبا دەستی پێکرد و دواتریش کەرتەکانی تری گرتەوە ئەمەش بۆ ژێرخانی ئابووری هەرێم سود بەخش دەبێت بۆ بە ئەنجام گەیاندنی تەواوەتی کارەکان, ئەوە ڕۆڵی حکومەت تەنها چاودێری کردن دەبێت, لەبەر ئەوە بانکی نێودەوڵەتی و سندوقی نەقدی نێودەوڵەتی هەڵسان بەدانانی مەرجی نوێ بۆ قەرز کردن ئەویش بە پەیڕەو کردنی بەرنامەی جێگیری ئابووری و چاککردنی هێڵکاری یەکەمیان ئامانجی چاک کردنی ناجێگیری لەتەرازوی پێدراو وبوودجەی گشتی بوو, بەلام دووەمیان ئامانجی گۆرینی هێڵکاری ئابووری بوو لە ڕێگای ئازاد کردنی بازرگانی دەرەکی و نرخی ئالو گۆڕی دەرەکی و پەیڕەو کردنی بەرنامەی بەتایبەت کردن. ناساندنی گشتی بۆ بەتایبەت کردن پرۆسەیەکی گواستنەوەیە یاخود گۆڕینی خاوەن دارێتییە یاخود بەڕێوبردنە بۆ پرۆژەکان و خزمەت گوزاریەکانی گشتی لە کەرتی حکومی بۆ کەرتی تایبەت, ئەویش لە ڕێگای شێوازی جۆراو جۆرەوە.

## شێوازەکانی بەتایبەت کردن:

بەتایبەت کردن جۆرەها شێوازی هەیە لە وڵاتێک بۆ وڵاتێکی تر ,لە پرۆژەیەک بۆ پرۆژەیەکی تردەگۆرێت. گواستنەوەی خاوەندارێتی کەرتی گشتی بە شێوەی هەمەوەکی یاخود بەشەکی بۆ کەرتی تایبەت ئەویش بەفرۆشتنی هەمەوەکی (گشتەکی) ڕاستەوخۆ یاخود بەشەکی لە پرۆژە گشتییەکە بۆ تایبەت (بەشێک لە پرۆژەکە دەفرۆشرێت لە خاوەندارێتی) ئەم رێگایە دیارترین ڕێگایە

*تەرخان کردنی بەرێوبردن : ئەم ڕێگایە سەرەتایە لە پرۆسەی بە تایبەت کردن ئەمانە لە خۆ دەگرێت .

أ-گرێبەستی کارگێری :ئەمەش بەپێی گرێبەست حکومەت لەگەڵ کەسەکان (جا کەسەکە ناوخۆی یان بیانی بێت )بۆ بەریوبردنی پرۆژە گشتیەکان .

ب-بەکرێدان :بەپێی گرێبەست حوکمەت پرۆژەکە بەکرێ دەدات بۆ وەبەرهێنانی سەرچاوەکانی لە لایەن کەرتی تایبەتی بە شێوەی بە کرێدان.

ت- گواستنەوەی خاوەندارێتی بۆ بەڕێوبردن و بە کرێ کار: ڕوودەدات لەکاتی بەتایبەت کردنی پرۆژە بچووکەکان و شێوەی گواستنەوەی خاوەندارێتی بۆ بەڕو بردن و کارەکان تێیدا .

لەوانەیە هەندێ لە وڵاتان چەند شێوازێک جێبەجێ بکەن لە یەک کاتدا لەسەر

پرۆژەکان چونکە نەرمی دەدات بۆ بەکار هێنانی شێوازی باش بۆ هەر حاڵەتێک لە جیاتی بەکارهێنانی یەک شێواز بۆ هەموو حاڵەتەکان.

## *ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی بەتایبەت کردن

أ-باشتر کردنی ئاستی لێهاتووی ئابووری بۆ پرۆژەکانی گشتی و بەتایبەتی ئەوانەی تووشی زەرەر هاتوونو بەهێزکردنی ڕکابەرایەتی تێیدا.

ب-کەم کردنەوەی قەبارەی خەرجی گشتی و تەسک کردنەوەی پێویستی بە قەرز کردنی ولاتەکە یاخود پرۆژەکە کە تووشی زەرەر بووە .

ت-هاندانی سەرمایە داری هاولاتیان لە ڕێگای فراوان کردنی خاوەندارێتی بۆ سەرچاوە ئابووریەکان جا چ بۆ کرێکاران یاخود هی تر.

ج-بە دەست هێنانی تەکنەلۆژیای نوێ لە ڕێگەی بەشداری کردنی کەسانی بیانی و هێنانی وەبەرهێنەران بۆ وەبەرهێنان .

د-بە دەست هێنانی دراوی پێویست بە بوودجەی گشتی ولات لە ڕێگای فرۆشتنی پرۆژەکان.

ح-باشتر کردنی جۆری کالاو خزمەت گوزاریەکان کاتێک پرۆژە گشتییەکە بەتایبەت دەکرێت.

و-بە هێز کردنی بازاڕی دراو چوونکە پرۆژەی بەتایبەت کردن وادەکات کە گەشەو چاک کردنی ئاڵو گۆری پشکو قەواڵەکان بکات لە بازاری دراودا.

## ئامانجی ولاتانی پێشکەوتوو دواکەوتو لە بەرنامەی بەتایبەت کردن ..

لەولاتانی پێشکەوتوو ئامانجی بەتایبەت کردن بۆئەم مەبەستانە دەبێ:

کەمکردنەوەی ڕۆڵی دەوڵەت لەبەرهەمهێنانی کالاو خزمەتگوزاریەکان ,زیادکردنی لیهاتووی بەرهەمهێنان بۆپرۆژەکان لەبەردەم بەرنامەی بەتایبەت کردن,فراوانکردنی خاوەنداریەتی پشک دەکات ,هۆکارێکی هەرە گرنگە بۆ بەدەست هێنانی دەسەلاتی سیاسی لەلایەن کاربەدەستانی دەسەلاتی سیاسی ولات ئەم بەرنامەیە بەکاردەهێنرێ بۆکەمکردنەوەی دەسەلاتی سەنتەرەکانی کرێکاران لەکەرتی گشتیدا.

بەلام لەولاتانی دواکەوتوو ئامانج لە بەرنامەی بەتایبەت کردەن جیاوازە چونکە ئامانجی سەرەکی لەجێبەجێ کردنی بەرنامەی بەتایبەت کردن لەو ولاتانە هەوڵدانە بۆچارەسەرکردنی قەیرانی ئابوری لەرێگای ئەم بەرنامەیەوە کە حوکمەتی هەریم تاردەیەک ئامانجی لەم بەرنامەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە بوو کە ڕووبەڕوی بووەوە لەسالانی ڕابردوو.

***لایەنە باشەکانی بەتیبەت کردن .**

بەرز کردنەوەی ئاستی لێهاتووی پرۆژە تایبەتەکان لە ڕێگای بەدەست هێنانی قەبارەی نموونەی بەرهەم,ئەمەش وادەکات بەرهەمهێن بگاتە بەرز ترین قازانج وە هاندانی ڕکابەرایەتی بە پێی تێگەیشتنی ئابووری بازاڕ کە بنەمای خاوەندارێتی تایبەت فراوان دەکات لەڕێگەیەوە ئەمەش بەهۆی نەمانی هەموو شێوازەکانی قۆرخکاری کە لە سیستەمی پلانی ناوەندی حکومەت درووست بوو بوو ئەم بەرنامەیە بەکاردەهێنرێت بۆ پەرە پێدانی بازڕی سەرمایە داری بۆرسەی دراوی کاغەزی کە بوونی نەبوو لە کاتی حکومڕانی کەرتی گشتی یاخود پلانی ناوەندی دەبێتە هۆی درووست بوونی پیشەو هونەری کاری نوێ وە هۆکارێکە بۆ کەمکردنەوەی بەشداری دەوڵەت لە چالاکی ئابووری و زیاد بوونی بەتایبەت کردن یارمەتی دەرە بۆ ئەوەی حکومەت بتوانێ و کاتی زیاتری دەوێ بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی تری .

***بێ گومان لایەنی خراپی تێدا بەدی دەکرێ:**

لەگەڵ ئەوەی پرۆسەی بەتایبەت کردن لایەنی باشی هەیە بەلام لە گەڵ ئەوەشدا لایەنی خراپی بەدی دەکرێ  لە هەندێ لە ولاتان ئەمەش بە کورتی .

ئەوەی بەسەر روسیادا هات لەکاتی باتایبەت کردنی پرۆژەکان (بە پێی قسەی زیوکانۆف سکرتێری حزبی شوعی روسی پاش ڕوخانی یەکێتی سۆڤیتی پێشو ) خراپ ترین پرۆژەی بەتایبەت کردن بوو لە مێژودا کە تێیدا مافیاکانی روسی و سەرمایە دارانی بیانی و سیاسیەکان لە گەورە بەرپرسەکانی حزبی شیوعی روسی دەستیان بەسەر پرۆژە گشتیەکان گرت بە نرخێکی زۆر کەم ,کە هەندێ لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە فرۆشتنی پرۆژە حکومیەکان بەهاکانیان نزیکەی (٢٠٠) ملیار دۆلار بوو بەلام بە نرخێکی زۆر کەم فرۆشراون کە بەنزیکەی تەنها بە (٧) ملیار دۆلار بووە .

دەرکردنی کرێکارانی دەوڵەت و زیاد کردنی ژمارەی هێزی کاری بێکار چوونکە دەرکردنی کرێکارەکان لە پرۆژە گشتیەکان یەکێکە لە کێشە هەرە گەورەکان لەکاتی پرۆسەی بەتایبەت کردن,وە زۆربەی جار ئەم پرۆسەیە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕێژەیەکی دیاری کراو لەکۆمەڵگا کە داهاتیان بەرزتر دەبێ ئەمەش وادەکات جیاوازیەک دروست ببێت یاخود دروست بونی چینایەتی لەداهاتی تاکەکانی کۆمەڵگا,ئەمەش دەبیتە هۆی ناسەقامگیری ولات لەلایەنی کۆمەلاتی و ئابوری و سیاسی وەبەرژەوەندی کەسایەتی گەشە دەسینێ,بێگومان ئەم پرۆسەیە گەر بە وردی بە ئەنجام نەگەیەنرێ ئەوە ولات توشی نەهامەتی دەکات .

**[*]چەند نمونەیەکی وڵاتـان لە پرۆسەی بـە تـایـبـەت کـردن کـە هـەنـدێـك لـەو وڵاتانە سەرکەوتوو بـوون لە پرۆسەکە و هەندێکیان سەرکەوتوو نەبوون بەم شێوەیە بە کورتی :**

*** وڵاتـانـی سـەرکـەوتـوو :**

١- **وڵاتی بریتانیا :** لەم وڵاتە پرۆسەی بە تایبەت کردن بەم شێوەیە بوو

أ- فرۆشتنی حەوت فڕۆکەخانەی حکومی و گواستنەوەی بۆ فڕۆکەخانەی بازرگانی کە کەرتی تایبەت بە ڕێوەی دەبرد وئەمەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە هـاوڵاتـیان توانـای کڕینی پشکی هەبێت ,کە زیاتر لە دوو ملیۆن هاوڵاتی توانیان نزیکەی ١,٤ ملیۆن پشك لە کارگەکانی ئەم فڕۆکەخانانەبکڕین

ب- فرۆشتنی نزیکەی یەک ملیۆن یەکەی نیشتەجێ بوونی حکومی بۆ ئەوانەی کە لە ناویدا دەژیان بە نرخی کەمتر لە نرخی بازار ئەمەش وای کرد ئاستی خزمەتگوزاریکانی ئەم یەکانە باشتر بێت و پاکتر بێتەوە , جگە لەمەش داهاتی حکومەت زیادی کرد و بووە هۆی کەم بوونەوەی خەرجی حکومیش.

ت- فرۆشتنی بە بەهـای ٤٠ ملیار دۆلار لە پرۆژەکانی حکومی و گواستنەوەی بۆ کەرتی تایبەتی , بەرزبوونەوەی بەشداری خێزانەکان کە پشکیان هەیە لە دوو ملیۆن بۆ دوازدە ملیۆن کەس و گواستنەوەی نزیکەی سێ چارەکە ملیۆن لە فەرمانبەرانی دەوڵەت بۆ فەرمانبەرانی کەرتی تایبەت لەبەر ئەوە بریتانیا توانی خۆی بووبووژێنیتەوە

٢- **وڵاتی ئەردەن** : لە ساڵی ١٩٨٥ پرۆسەی بەتایبەت کردن دەستی پێ کرد ,کە بەشێک بوو لە بەرنامەی ڕاستکردنەوەی ئابووری , ئـامـانـجـی بـەرنـامـەکـە بـەرزکـردنـەوەی لێهاتووی پـرۆژەکـان و بـەرزکـردنـەوەی تـوانـای رکـابـەرایـەتـی کـردن بـوو تیایدا , هـەروەهـا هاندانی پاشەکەوتی ناوخۆی و , هاندانی وەبەرهێنان و ڕزگاربوون بوو لە دەست پرۆژە زەرەرمەندەکان هاندانی پاشەکەوتی ناوخۆی بـەرەو وەبەرهێنانی ماوەی درێژخایەن بە ڕێگای بەڕێوبردنی نوێ وە دۆزینـەوەی ڕێگای بەریوبردنی نوێ , لەبەر ئەوە حکومەتی ئەردەن هەڵسا بە دامـەزرانـدنـی جێبەجێکاری تایبەتی لە تەموزی ١٩٩٦ بەسەرپەرشتی لایەنی باڵا لە دەوڵەت کارگەی چیمەنتۆ ئەردەن لە ساڵی ١٩٩٨ و کارگەی پەیوەندی کردنی ئەردەن بـە تـایـبـەت کـران , لـە کـارگـەی چیمەنتۆ سێ بەشی پشکی ئەم کارگەیە فرۆشرایە کارگەیەکی فەرەنسی .دەرکـەوت پرۆسەی بـە تـایـبـەت کـردن لایـەنـی ئـەرێـنـی هەبوو لەسەر هەردوو کارگەکە بە جۆرێک کارگەی چیمەنتۆ بەرهەمی زیاد بوو بە زیادەیەکی بەرچاو لە ساڵەکانی ٢٠٠١ بۆ ٢٠٠٢ وە کەمبوونەوەی ژمارەی کرێکاران کە ئەویش ئاماژە بەوە دەکات لە بەرزی بەرهەمداری کـرێـکـاران ئـاسـتـی قـازانـجـی هـەمـەوەکـی زیادی کرد بە زیادەیەکی بەرچاو ئەمەش

ڕەنگدانەوە بوو لەسەر ڕێژەی قازانجی دابەشکراو لەبەر ئەوە بووە هۆکار بۆ بەرزبوونەوەی بەهای پشکی ئەم کارگەیە لە سالی ٢٠٠٢ پاش ئەوەی کە ناجێگیر بوو لە ماوەکانی پێشتر لەبەر ئەوە ئەم کارگەیە ئاستی زۆر باش بوو پاش بە تایبەتی کردنی و ڕەنگدانەوەی زۆری هەبوو بەسەر کەرتەکانی تری ئابووری لە وڵاتدا .

### وڵاتانی سەرنەکەوتوو :

١- **وڵاتی مالیزیا** ئامانجی سەرەکی لە پرۆژەی بەتایبەت کردن بەم شێوەیە بوو :

أ- دووبارە دابەشکردنەوەی داهات لە نێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگا.

ب- کەمکردنەوەی بارقورسی دراوی بەڕێوەبردنی حکومەت .

ت- باشترکردنی بەرهەمهێنان و گەشەی ئابووری .

بەڵام ئەم پرۆسەیە سەرکەوتوو نەبوو لە وڵاتی مالیزیا چونکە ئەم پرۆسەیە بووە هۆی بەرژەوەندی کەسیی واتا چەند کەسێک هەوڵیاندا ئەو پرۆژانە دیاری بکەن بۆ پرۆسەکە , کە بۆ کێ بن و بە چی ڕێگایەک بێت . هەروەها ئامانجەکانی پرۆسەکە چاکسازی ئابووری نەهێنایە ئاراوە تاکو پاش ٥ ساڵ لە جێبەجێکردنی پرۆژەکە .

بەتایبەت کردن نە بووە هۆی دروستبوونی ئاستی ڕکابەرایەتی بەلکو پرۆژەکان وەک خۆی مانەوە بە شێوازی قۆرخکاری گواستنەوەی کەرتی گشتی بۆ کەرتی تایبەتی ئامانجی نزمبوونەوەی لە تێچوونی بەرهەمهێنان نە هێنایە دی و نەبووە هۆی باشترکردنی جۆری خزمەتگوزاریێکان بە شێوەیەکی بەرچاو .

٢- **وڵاتی روسیا** :ئەم پرۆسەیە زۆر کێشەی نایەوە لە وڵاتی روسیا , نەگەیشتە ئامانجەکانی خۆی , روسیا گواستنەوەی خاوەندارێتی بۆ زیاتر لە ١٥هەزار پرۆژە لە کەرتی گشتی بۆ کەرتی تایبەتی کرد ,چاوەڕێ دەکرا ئەم پرۆژە سەرکەوتوو بێت بەرەو ئابووری بازار بڕوات , سیستەمی دراوبازاری دروست بێت بۆ کەسەکانی ناوخۆی و خاوەندارێتی بکەن , بەلام ئەمانە هەمووی نەهاتە دی لەبەر ئەوەی کرێکارەکان ترسان لە وڵاتی دەرەکی و لە دەستدانی دەسەڵاتی خۆیان و حکومەتی روسیا سەرکەوتوو نەبوو لە سیاسەتی باوەڕپێکردنی هاوڵاتیان و فراوان بوونی پرۆژەکان و پرۆسەی بەتایبەت کردن لە زۆربەی بارەکاندا گەندەڵی تێداکرابوو .

# مزگەوتی کەلار لە بەڵگە نامەیەکی ساڵی ١٩٤٧ دا



مستەفا سەعید

بەڵگە نامەی یەکەم پێمان دەڵێن ئەوکاتە داود بەگ جاف **(١٩٠٥-١٩٦٦)** ئەوکاتە ئەندامی پەرلەمانی عێراق بوو . کە پێی وتراوە «نائب» لەرۆژی ١٩٤٧/٧/٢٣ سەردانی بەڕێوەبەری گشتی ئەوقافی کردوە سەبارەت بەبرینەوەی موچەیەک بۆ هەر یەک لەمەلا مستەفا مەلای مزگەوتی گوندی کەلار و مەلا سعید مەلای گوندی گوندی کوڵەجۆ لەناحیەی قەرەتەپە.

بۆیە لەسەر ئەم داواکارییە بەڕێوبەری گشتی ئەوقاف بە دەست و خەتی خۆی نامەیەک دەنێرێت بۆ بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوک کە ئەمە دەقەکەیەتی:

**ئازیزم کاک ڕۆف بکر**

**بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوک**

**دوای سڵاو . بەڕێز پەرلەمانتار داود جاف سەردانی کردم و داوای لێ کردم موچەیەک ببڕمەوە بۆ هەر یەک لەمەلا مستەفا مامۆستا لەمزگەوتی گوندی کەلار لەناحییەی شێروانە لەقەزای کفری و مەلا محمد سعید مامۆستا لەگوندی کوڵەجۆ لەناحییەی قەرەتەپە.**

**ئێمە هیچ زانیاریەکمان نیە لەسەر خۆیان و ئەو ئەرکانەی جێبەجێی دەکەن، بۆیە داواکارم لەبەڕێزتان بۆخۆتان بڕۆن بۆ بینینی ناوبراو داود جاف و ئاگاداربوون**

لەهەرچی وردەکاریەکانە لەزاری خۆیەوە ئەمجا بچۆرەوە سەردانی هەردوو گوندی ناوبراو و دوای ئەوە ڕاپۆرتێکی دوور ودرێژمان لەبارەیانەوە پێشکەش بکە لەگەڵ ئەو پێشنیارانەی بەباشی دەزانیت

بەزووترین کات و والسلام

٢٣/٧ واژوو



عزيزي السيد رؤوف بكر
مدير اوقاف كركوك
بعد التحية . راجعني الاستاذ السيد داود الجاف [illegible]
تخصيص راتب الى كل من الملا مصطفى المدرس في جامع قرية
كلار في ناحية شيروانه من اقضية كفري والملا محمد سعيد
المدرس في قرية كلاجو في ناحية قره تبه .
وحيث انه لا يوجد لدينا اي معلومات عن [illegible]
[illegible] فأود منك ان تذهب بنفسك
لناحية [illegible] داود الجاف وتطلع على [illegible]
[illegible] لزيارة القريتين المذكورتين [illegible]
[illegible] اسبوع [illegible] والسلام
٢١/٧

بەڕێوبەری ئەوقافی ناوچەی کەرکوک لەبەرواری **٣١/٧/٩٤٧** بەنوسراوی ژمارە **١٢٠/٢٣٣٣** بەمجۆرە وەڵامی بەرێوەبەری ئەوقافی گشتی دەداتەوە وەک لەبەڵگەنامەی دووەمدا هاتووە:

**بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی ناوچەی کەرکوك**

**ژمارە ١٢٠/٢٣٣٣**

**بەروار ٣١/٧/٩٤٧**

**بەڕێوبەرایەتی ئەوقافی گشتی**

**هەردوو مزگەوتی کەلار و کوڵەجۆ**

**بەگوێرەی فەرمانی تایبەتیتان لەبەرواری ٢٣/٧/٩٤٧**

**سەردانی (داود جاف)م کرد لەگوندەکەی خۆی وردەکاری و زانیاری پێویستم وەرگرت لەسەر بارودۆخی هەردوو مزگەوتی کەلار و کوڵەجۆ ، دوای ئەوە سەردانی هەردوو مزگەوتی ناوبراوم کرد ئەمەش خستنە ڕووی ئەنجامی ئەو وردەکاری و تێبینیانەیە کە پێی گەیشتووم**

**مزگەوتی گوندی کەلار**

**ئەم مزگەوتە لەلایەن یەکێک لە سەرۆکەکانی جافەوە بەناوی حسن کوڕی سلیمان بەگی کوڕی حەمە پاشای جافەوە بەر لە٣٦ساڵ دروستکراوە ، میحرابێک و جێگایەک بۆ وتاری هەینی و دوو ژوورە یەکێکیان بۆ ئیمام و ئەوەیترین بۆفەقێکان لەگەڵ گۆڕەپانێکی گەورە و جێگایەک بۆ ئاودەست . هیچ وەقفێکی نیە.**

**ناوبراو مەلا مصطفی ی کوڕی علی نزیک بیست ساڵە کاری ئیمامەت و وتاربێژی و وانە وتنەوە وبانگدان دەکات بەبێ هیچ موچەیەک و پارەیەک ناوبراو خەلکی گوندەکەیە شافعی مەزهەبە ولەلای ڕێزدار مەلا قادری صۆفی خوێندویەتی کە یەکێکە لەزانایانی کوردستان ولەلای ئەو ئیجازەی مەلایەی وەرگرتووە. وانەی ئاین و عەرەبی زیاتر بە دە قوتابی دەڵێتەوە و هیچ داهاتێکی نیە جگە لە فەدانێک زەوی کە بەخۆی دەیکێڵێت وەلەسەری دەژی و باری ئابوری پێویستی بە ئاوڕ لێدانەوەیە . چونکە تەمەنی٤٥ ساڵە و خێزانەکەی پێکدێت لە ژنەکەی و چوار کوڕی بچوک وکچێک وێرای ئەوەی ئەرکەکەی جێبەجێ دەکات لەمانگی ڕەمەزانیشدا کاری وەعز و ئامۆژگاری دەکات و ڕێنومایی**



مديرية أوقاف منطقة كركوك
العدد ٢٠/٢٢٢٢
التاريخ ٢١/ ٧/ ٩٤٧

مديرية الأوقاف العامة

جامعي قريتي كلار وكوله جو

حسب امركم الخصوصي المؤرخ ٢٣/٧/٩٤٧
لقد واجهت داود الجاف في قريته واخذت منه التفصيلات اللازمة من حالة جامعي كلار وكلوجه وتم ذهبت الى زيارة الجامعين المذكورين وحررت ادناه الايضاحات التي توصلت اليها بنتيجة التدقيقات والمشاهدات.

آ — جامع قرية كلار

ان هذا الجامع كان قد انشاء من قبل احد رؤساء الجاف المدعو السيد حسن منذ ٣٦ سنة وهو يحتوي على محراب وفيه محل لخطبة الجمعة وغرفتين احداهما للامام والثانية لطلاب العلم مع ساحة كبيرة ومحل للمراحيض ولاتوجد له موقوفات وان المدعو الملا مصطفى [illegible] قائم بواجبات الامامة والخطابة والتدريس والاذان في الجامع المذكور منذ عشرين سنة بلا راتب ومخصصات وان المومى اليه من اهل القرية وشافعي المذهب وانه قد حصل العلم من صاحب الفضيلة الملا نادر الصوفي احد علماء كردستان وبيده الاجازة منه وهو يدرس العلوم الدينية والعربية الى عشرة طلاب على الاكثر وليس له شيء للايراد سوى فدان واحد يزرعه بنفسه ويصرف عليه وان حالته تستلزم الرأفة لانه يبلغ من العمر ٧٥ سنة وان عائلته مؤلفة من زوجته واربعة اولاد صغار وبنت وعلاوة على ما تقدم من الواجبات يقوم بالوعظ في شهر رمضان وانه يقوم بارشاد اهالي القرى المجاورة لقريته وتعليمهم امور دينهم وهو الوحيد من العلماء في تلك القرية وان داود الجاف واهل القرية قد شهدوا بنزاهته وورعه وعفته وحتى الآن لم يخصص احد شيء من حوائج المعيشة.

مدير اوقاف منطقة كركوك

**خەلکی گوندەکانی چواردەوریش دەکات و لەئاینەکەیان شارەزایان دەکات ، تەنیا مەلایە لەگوندەکەدا و داود جاف و خەلکی گوندەکە شاهیدی پاکی و وەرع و دەستپاکی بۆ دەدەن ، تائێستا داوای هیچ شتێکی لە کەس نەکردوە.**

**واژوو**

**بەرێوەبەری ئەوقافی ناوچەی کەرکوک**

ئەوەی لەم بەڵگەنامەیە بۆمان دەردەکەوێت:

**١**-مزگەوتەکەی گوندی کەلار لەلایەن حسن بەگی کوڕی سلیمان بەگی حەمە پاشای جافەوە دروست کراوە . تەنانەت بیستوومە لەکاتی دروستکردنیدا حەسەن بەگ و فاتمە خانی خێزانی حەسەن بەگ کە گچی وەسمان پاشای جاف و خوشکی هەردوو شاعیر تایەر بەگ و ئەحمەد موختار جاف بووە بەکۆڵی خۆیان خشتیان بۆ مزگەوتەکە کێشاوە.

**٢**-مزگەوتەکە لەساڵی **١٩١١** دروستکراوە.

**٣**-مەلا قادری صۆفی دەکاتە باوکی مەلا ئەحمەدی بانی خێڵان

٤-مەلا مستەفا کە ئەوکات تەمەنی ٤٥ ساڵ بوبێت کەواتا لەدایکبووی ساڵی **١٩٠٢** بووە

٥- بۆ یەکەمجارە ئەم بەڵگەنامەیە بڵاو دەکرێتەوە.



دلێر عەبدولڕەحمان

# چالاکییەکانی فێستیڤاڵی ٤٨ هەمین ساڵیادی ڕۆژی کەلار



بەدروشمی (کەلا لە ناوەندی ئیدارەی گەرمیانەوە بۆ مەڵبەندی پارێزگایەک) و بەچاودێری سەلاح کوێخا سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان و سەرپەرشتی شەهاب حاجی ئەحمەد قایمقامی قەزای کەلار و ئامادەبوونی بەڕێوەبەری ژمارەیەک لە بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانگە و دامودەزگا حکوومییەکانی گەرمیان و و ڕۆژنامەنووسان و ڕۆشنبیران، لیژنەی باڵای یادی کەلار فێستیڤاڵی ٤٧ هەمین ساڵیادی ڕۆژی کەلاری ئەنجامدا.

ڕۆژی یەکەمی فێستیڤاڵ لە ٢٠١٧/٢/٢٧ لە هۆڵی کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی گەرمیان، گرتەیەکی ڤیدیۆیی لەژێر ناوی (گوزەرێک بەناو یادگارییەکانی شاری کەلاردا) لە ئامادەکردنی دیار ڕەشید و دلێر عەبدولڕەحمان نمایشکرا و دواتریش لەژێرناوی (کەلار و دەورووبەری لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە مێژووییەکاندا) سیمینارێک بۆ مامۆستا خالید مەحمود کەریم ئەنجامدرا، پاشنیوەڕۆی هەمان ڕۆژیش ڕێپێوانی پێکهاتەکانی گەڕەکەکانی کەلار و هەڵگرتنی ئاڵای کوردستان لەلایەن یانەی شێروانەوە لە تەنیشت تەلاری حەمەی ئایشەوە بۆ پارکی مەشخەڵ دەستپێکرد و پێشانگایەک بەناوی (دیوانی

شاعیرانی کۆچکردووی کەلار) بۆ پشکۆ محەمەد ڕۆستەم کرایەوە، بۆ شەویش لەسەر قەڵای شێروانە مەراسیمێک بەناوی وەفایەک بۆ قەڵای شێروانە ئەنجامدرا.

ڕۆژی دووەمی فێستیڤاڵ لە ٢٠١٨/٢/٢٨ لەهۆڵی بەڕێوەبەرایەتی وەرزش و لاوانی گەرمیان، پەردە لەسەر نەخشەی گەڕەکەکانی شاری کەلار لادرا کەلەلایەن پشکۆ محەمەد ڕۆستەمەوە ئامادەکرابوو، دواتریش وتاری لیژنەی باڵای ئامادەکاری فێستیڤاڵ و قایمقامی کەلار خوێندرانەوە و لەلایەن هونەرمەندان ساڵح حوسێن و ڕەفعەت گەرمیانییەوە چەند پارچە گۆرانی و هۆرەیەک پێشکەشکران، هەروەها فیلمێکی دۆکیۆمێنتاری بەناوی (خەونی شارێک) نمایشکرا کەلەلایەن محەمەد سابیرەوە ئامادەکرابوو، هاوکات دەقی کەلار شاری ناو یادەوەرییەکانمان لەلایەن بێستون ژاڵەییەوە خوێندرایەوە، ئێوارەی هەمان ڕۆژ پانێلی (ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە پێشخستنی شاری کەلاردا) بۆ هەریەکە لە دڵشاد ئەنوەر، جیهان محەمەد، سەباح عەلی جاف، بێستون ژاڵەیی لە هۆڵی پەیمانگای تەکنیکی تایبەتی کەلار ئەنجامدرا.

فێستیڤاڵی ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار، ماوەی چوار ساڵە لەسەریەک بەسەرپەرشتی قایمقامیەتی قەزای کەلار و بەهاوکاری ژمارەیەک ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووس و کەسایەتی و مامۆستا و دکتۆر و چالاکوانی مەدەنی، لە شاری کەلار ئەنجامدەدرێت.

# کۆنوێ

## ئەلبومی یادەوریێکانی شاری کەلار

فۆتۆ و دیزاین
دیار رشید & نیعمەت مەلۆ



